حوسەینقولیخانی کولیایی؛ ئەمانە هەموو لەسەر قسەی «سەردار رەشید» و بۆ یاریەدانی ئەو بە رێ کەوتن بۆ ولاّتی «سنە» و حەسەناوا -کە شوێن ئاگردانی ئەمارەتی باوباپیری «سەردار رەشید» بوون -

لەو مێژووەدا چووە سنەوە بە ناوی ئەوەوە کە حکومەتێکی کوردی سەرلەنوێ دروستبکاتەوە، دەستی دایە و ماوەیەکی باش دەورێکی گێڕا، روسەکانیش لەژێرەوە قسەیان دایە، بە تایبەتی «جەنەراڵ فسینکۆ، جەنەراڵ باراتۆف» -کە ئەفسەرانی روس بوون و ئەو ولاّتەیان لەو دەوری هەرچی و پەرچییەدا داگیر کردبوو -پەیمانیان دایە کە بە هەموو جۆر بۆ دامەزراندنی ئەم حکومەتە درێغی بۆ نەکەن. ئەو لەوێوە لە دروستکردنی ئەم کار و فەرمانەدا بوو، لەملاشەوە لە ولاّتی سولەیمانی و شوێن هەواری بابانەکان، هەر لەو سەردەمانەدا «شێخ مەحموی شێخ سەعید»یش خەریکی گێڕانی دەوری کوردایەتی بوو.

«عەباسخان» لەو سەردەمانەدا کە هێشتا بە ناوی حوکمدارییەوە نەهاتبووەوە «سنە»، هەر جارە لە «رەوانسەر»ەوە دەستدرێژی بۆ کرماشان و دەوروبەری کرماشان ئەکرد، دەنگ و ئاوازی «سالارئەلدەولە»ش لەو وەختانەدا لەو ناوەدا بارێکی باشی هەبوو، ئەویش بۆ سەندنەوەی تەختی ئێران -کە گۆیا لێی زەوت کرابوو -لەبەرئەوە هەر دووکیان شەریکی یەک دەرد بوون، «سەردار رەشید» لەگەڵ ئەویشا قسەی کردبوو. جا لەو دەورانەدا پەلامارێکی مەردانەی دایە سەر کرماشان، مەحەممەد خانی کرماشانی -کە ئەویش کرماشانی داگیر کردبوو -گرتی و کوشتی و ولاّتی کرماشانی بە تەواوی داگیرکرد، دیارە لەو سەردەمەدا کە حوکمڕانی ولاّتی «سنە» و ئەردەلاّن بوو، حوکمداری کرماشانیشی هەر دەنگی ئەدایەوە، لەم ماوەیەدا کە لە «سنە» بوو، عەلی ئەکبەرخانی سنجاوی -کە ئەویش پیاوێکی ناودار و بە دەسەلاّتی عەشایری بوو، هاتە «سنە»؛ ئەویش فەرمانداریی «سەردار رەشید»ی گرتە دڵ.

«سەردار رەشید» ماوەیەک بەمجۆرە بە ناوی حوکمدارییەوە لە سنە رایبوارد و حوکمی لەو ناوەدا رەوابوو. پاشان وردە وردە شەڕی ١٩١٤ - ١٩١٨ بەسەر چوو و هەر پاشەلەقەکەی مایەوە، حکومەتی ئێران تۆزێ بووژایەوە، لەملاشەوە ئەعیان و سەرمایەدارەکانی «سنە» لەبەرئەوە کە زۆرتر حکومەتی بێگانە پەرست و ئاژاوەچی بوون، «سەردار رەشید» سەیری کرد مانەوەی لە «سنە» دا وەنەبێ قازانجێکی تیابێ، وای بە باش زانی ئەو شوێنی حوکمڕانییەی لە سنەوە بگوێزێتەوە بۆ «رەوانسەر».

شەو لە ناوکاێک «عەلی نەقی خانی ئاسەفئەلدیوان» -کە یەکێک بوو لە پیاوە هەرە بە دەسەلاّت و خاوەن مڵکەکانی سنە، لەبەرئەوەش کە ئەم پیاوە هەموو دەورێک هەر ئاگری بنکا بوو بۆ [سەردار رەشید] -بەناوی فڕاندنەوە فڕاندی و گەڕایەوە بۆ [رەوانسەر]. پاش ماوەیەک بە تکا و پاڕانەوەیەکی زۆری پیاو ماقوڵەکانی تری [سنە] بەرانبەر بە پارەیەکی زۆر «ئاسەف»ی بەرەلاّ کرد.

کـە سـەردار لە [سـنە]دا نـەما، حکـومەتی تـاران بـە نـاوی حـوکمداریـیەوە «عـەلی محەمەدخانی شەریف‌ئەلدەولە»ی نارد بۆ سنە. شەریف‌ئەلدەولە لە ١٣٣٧ی هجری چووە سنەوە و دەستی کرد بە توندوتیژی و سیاسەت بە کارهێنان. لەولاوە [سەردار ڕەشید]یش هەر داوای سنە و وڵاتی ئەردەڵان ئەکا و هەرجارە ئـەیەوێ هـێرش بکـا بـۆ دەرپـەڕانـدنی [شەریف‌ئەلدەولە] لە ناوشار!.

[شەریف‌ئەلدەولە] پیاوێکی فێڵباز و پیلانگێڕ بوو! لە وەختی تیژیدا توندی ئەنواند و لە وەختی کولیدا نەرمی! سەیری کرد مانەوەی [سەدار ڕەشید] بەوجۆرە بۆ ئەو دەست نادا، بە شەڕ و شۆڕیش چاری ناکا. هێنای کەوتە پیلان بازییەوە لەگەڵیا، خەبەری بۆ نارد کە:

«لەبەرئەوە لەم سەردەمانەدا و لەم ناوەدا «سالارئەلدەولە» دەنگ و ناوی هەیە و بە تەمای ئەوەیە کە بە پشتیوانی کوردەکان تەختی ئێران و حکومەتی تاران وەربگرێتەوە، حکومەتی تاران لەبەرئەمە کەوتۆتە پەرۆشەوە، ئێستە حکومەتی شاهەنشاهی «ئەحمەد شـا» بـڕیاری لەسەر ئەوەدا کە حکومەتی ئەردەڵان بۆ تۆ بێت، بۆیەش ئەم بڕیارەی‌دا، چونکە ئـەگـەر حکومەتی ئەردەڵان بۆ تۆ بێت؛ تۆ هەر ئەوەت ئەوێ و ئەوا دەستت کەوت و ئەشبیت بە پشتیوانی حکومەتی [تاران]، بـەڵام ئـەگـەر سـالارئەلدەولە بـێت، ئـەو وەختـە ئـەو داوای حکومەتی تارانیش ئەکا و بۆی ئەکەوێتە تەلاشەوە، منیش ناتوانم ئێستە [سنە] بەجێ‌بێڵم و بێم بۆلای تۆ، چونکە هەر کە بەجێم هێشت، [سالارئەلدەولە] دێتە ناوشارەوە، لەبەرئەوە کە لە ١٣٢٣ دا لەلایەن شابابایەوە ـ موزەفەرەدین شا ـ حاکمی سنە بووە و لەگەڵ هەموو پیاو ماقوڵ وکاربەدەستەکانا ئاشنایەتی هەیە، ئەهلی شار مەیلی ئەو ئەکەن و ئیتر دەرچوونی لەو ناوشار جارێکی کە نایێتەوە.

لەبەرئەم شتانەکە بۆم باسکردیت؛ تۆ وەرە بۆ [سنە]، حکومەتەکەت تەسلیم ئەکەم و من بە ناوی حوکمەوە ئەچم بۆ وڵاتی شیراز و ئەسفەهان!».

ئەم قسە خۆشە کوێستانییانە کارێکی باشیان‌کردە سەر دڵی سەردار ڕەشید و دڵیان فێنک کردەوە! بەبێ گیروگرفتی لە ٢٣ی جمادی‌الاولی ١٣٣٨دا بە چەند کەسێکەوە بە تەمای بنج بەستکردنی ئەمارەتی لە دەستچووی ئـەردەڵانەوە گـەڕایـەوە نـاوشاری [سـنە] و شـوێنی میوانداریی لە لایەن [شەریف‌ئەلدەولە]وە بۆ چاک کـرابـوو، چـووە ئـەوێ، چـەند ڕۆژێک خـزمەتێکی شـاهانە کـرا! خـزمەتێکی واکـە مـەرگەر هـەر [شـەریف‌ئەلدەولە] بـۆ [سەردار ڕەشید]ی کردبێ!.

لە ئـاخرا لە ڕۆژی ١١ی جـەمادی‌ئەلسانیا بـانگیشتنێکی تایـبەتی بـۆ کـرد لە سـەرای حکومەتی دا «دەرماڵ» بۆ ئەوە ئەو ڕۆژە لەوێ کاروباری ئەمارەتی ئەردەڵانی تەسلیم بکا!. سەردار هەڵسا و چوو، لە پاش هەندێ قسەکردنی کەم [شەریف‌ئەلدەولە] گرتی و لە پاش ١٥ ڕۆژ ناردی بۆ تاران!.

سەردار ماوەیەک لە [تاران] بە بەندی مایەوە، لە ئاخر و ئۆخری ساڵی ١٣٣٩دا «سەیید زیائەلدینی تەباتەبایی» وەزارەتی ئێرانی گرتە دەست و لە دەورەی ئەوا سەردار رەشید بەرەڵا بوو، گەڕایەوە بۆ وڵاتی رەوانسەر، پاش بەینێک دیسان کەوتەوە کۆکردنەوەی خۆی و لە ١٣٤٠دا کەوتەوە قسەکردن لەگەڵ عەشایرەکانا هەر بۆ سەندنەوەی ئەمارەتی ئەردەڵان، دەستەیەکی باش لە [رەوانسەر]ی و جوانڕۆیی و سنجاوی پێکەوەنا و دیسان ناو و دەنگی بڵاو بووەوە.

لەم دورانەدا «رەزاخان» وەزیری جەنگ بوو، سەرلەشکرێک هەبوو «ئەمیر ئەحمەدی» یان پێئەوت و لە کرماشان بوو، رەزاخان فەرمانی چارکردنی [سەردار رەشیدی]ی کردە سەرئەم ئەمیرئەحمەدییە. ئەمیرئەحمەدی لە پێشا هات [جافرسان] و [مەحموخانیدزڵی] و [حسەینخانی رەزا] و گەلێ گەورە تری کۆ کردەوە و سوێندی پێ خواردن کە بە پشتیوانی حکومەتی ئێران سەردار رەشید لە ناو بەرن!. ئەوانیش بۆ لە ناوبردنی کوردێکی وەکو [سەردار رەشید] هیچ درێغیان نەکرد و سوێنخوار بوون!.

[سەردار رەشید] ئەم خەبەرەی وەرگرت، بە ٤٥٠٠ سوارێکەوە پەلاماری هێزی عەشایر و [جافرسان]ی دا، لە کێوەکانی «شمشێر» جەنگ هەڵگیرسا، هێزی جافرسانیش زیاتر لە ٤ هەزارێک بوو. لە بەر سەختیی شوێنەکە و بەفر و سەرما، سەردار رەشید هیچی پێ نەکرا و گەڕایەوە بۆ وڵاتی [رەوانسەر]. پاش ئەوە «ئەمیر ئەحمەدە»ی دیسان ئەچێتەوە سەری و رەوانسەریشی پێ بەجێ دێڵێ. سەردارکە زانی هیچی بۆ ناکرێ و بە هەر لایەکدا کە ئەڕوا، کوردە بێگانە پەرستەکان هەر پەلاماری ئەدەن، یەکسەر ئەچێ بۆ هەمەدان و لەوێ خۆی ئەدا بە دەستەوە و لەوێشەوە ئەیبێرن بۆ «تاران» و لەوێ ئەمێنێتەوە بە ناوی بەندییەوە.

پاش مانەوەی ماوەیەک ئاژاوەیەک لە تاران دەستی پێکرد، سەردار رەشید ئەمەی بەهەل زانی، خۆی گۆڕی و هەڵات، هاتەوە بۆ [رەوانسەر] و دیسان کەوتەوە ئیشکردن، ئەمجارەش دیسان کوردەکان عێڵجارێکی تریان لێکردەوە، ناچار لە پاش چەند شەڕێکیتر سەر لەنوێ وڵاتی بەجێ هێشتەوە و چوو بۆلای «شێخ مەحموی شێخ سەعید»، لەوێش هیچی بۆ نەکرا، چوو بۆ «موحەمەرە» بۆلای «شێخ خەزعەل» لەوێش هەر هیچ، چوو بۆ بەغدا! لەو وەختەدا «رەزاشا» لە بەغدا بوو، بۆ «نەجەف» ئەچوو، چووە لای و داوای لێبووردنی لێکرد، ئەمجا گەڕایەوە بۆ کوردەواری بەهۆی [شێخ حیسامەئەدین]ەوە لە ساڵی ١٣٤٢ی هجریدا چوو بۆ سنە، ئەو سەردەمە «موزەفەرخانی سەردار ئینتیسار» حاکمی سنە ئەبێ، تەلگرافیکی زۆر لە بارەی سەردار رەشیدەوە ئەکرێ بۆ تاران. لە ئاخرا حاکم، سەردار ئەنێرێ بۆ تاران و دیسان ئەکەوێتە گیری دەست بەسەریی، تا ساڵی ١٩٤١ز ـکە کاروباری ئێران تێکچووەوە، قەسری قەجەر شکێنرا، سەردار رەشیدیش رزگاری ئەبێ. بەڵام ئیتر بە ئارەزووی خۆی هەر لە «تاران» دەرنەچوو، ئێستەش هەر لەوێیە.

وەکو تەماشامان کرد «سەردار رەشید» هەر لە دەورەی گەنجیەوە تا کەوتە ئەو رۆژی پیری و چاو کزبوونە، لە ئەڵهای ئەمارەتی کوردی و حکومەتێکی کوردیدا بوو، هەموو جار کۆششەکانی بەهۆی چەند کەسێکی چڵێسی بێگانە پەرستەوە ئەدرا بە بادا.

سەیرتر ئەوەبوو ئەو کوردانە کە وەختی خۆی بە قسەی سەردارەکانی ئێرانی هەڵئەخەڵتان و ئەچوون بەگژ [سەردار رەشید]دا و نەیانئەهێشت حکومەتی سەردار رەشید سەربگرێ، ئەو کوردانە لە پاش ئەوەکە رەزاشا شوێنی خۆی لە تەختی ئێرانا قایم کرد، بەرەبەرە تێیان کەوت و بە هۆی سەر لەشکر [ئەمیر عەبدوللاخانی تەهماسبی]ەوە، یەکەیەکە گرتنی و لە تاران لە «قەسری قەجەر»ی توند کردن!. ئەگەر ساڵی ١٩٤١ز-نەبوایە و [قەسری قەجەر] نەڕوخێنرایە ئەوانە جارێکی کە شوێن هەواری خۆیانیان نەئەدیەوە. خۆ ئەوانەشیان کە دەربەدەر بوون وەکو [جافرسان] و [مەحموخان]ی دزڵی؛ ئەوە بە کەساسی لە گۆشەی شارانا سەریان نایەوە.

جا ئەمەیە ئاخری هەموو بێگانە پەرستییەک و هاوخوێن نەویستنێک!.

# شۆڕشی شێخ مەحمود

شێخ مەحمودی شێخ سەعید
[١٨٨٢ز ـ ١٩٥٦ز]

لە ئاخروئۆخری دەورەی عوسمانییەکانا لە هەموو لایەکەوە لە وڵاتـە ئیمپراتۆرییەکـەیانا هـەر سـاتە نـەساتێک ئـاژاوە و هەرایەک پەیدا ئەبوو. وا دیارە ئەمە لەبەرئەوە بوو کە ئاو، ئەگەر زۆر مایەوە بۆگەن ئەبێ!. ئەمە و دیسان [ئاوروپا]ییەکانیش هەر زۆر دەمێـک بـوو کـەبە جۆرێکی «خـەیرمویاشر» دەستیان خسـتبووە نـاو حکـومەتەکـەوە، بەڵکو لەوانـە بـوو چـنگیان هاویشتبووە ناو کۆشکی پادشاکانیشەوە!. ئێجگار کـە شـەڕی ١٩١٤ ـ ١٩١٨ هـەڵگیرسا ئـەوەندەی‌تر بـزووتنەوە و ئـاژاوە لە هەموو لایەک زیاتر پەرەی سەند.

لە وڵاتی سـولەیمانی «کاکەئەحمەدی شێخ» و بەرەی کاکە ئەحمەد هەبوون. کاکە ئەحمەدی کوڕی شێخ مارفی نودێی، بەناوی پیاوێکی زانـای لەخـواتـرسـەوە نـاوبانگی بـۆ هـەموولایەک دەرکردبوو. ناوبانگی عیلمە فراوانەکەی شێخ مارفی نودێی باوکی و لەخواترسییەکەی خۆی ئەم دووانە پاڵیان پێوەنابوو بۆ ئەوەکە شایەکانی ـ ئیمپراتوریەتی عوسمان و شاهەنشاهی ئێران ـ وەکو یەک بیناسن و یەک‌لەیەک زیاتر ڕێزی لێبگرن.

وڵاتی سـولەیمانی ئـەو دەورە ـ وەکـو ئێـستە ـ سـەر سنووری بـەینی بـەشەخاکی شـای عوسمانی و شای ئێران بوو، هەر لە دیوی سولەیمانی ئاوابوونیایە ئەچوویتە خاکی ئێرانـەوە. هەرچەندە سنوور بەناو هەبوو لە بەینی ئەم دوو حکومەتەدا، بەڵام هات و چۆ کردن ئەوەندە بە سانایی بوو وەکو لە گەڕەکی شارێکەوە پیاو بچێت بۆ گەڕەکەکەی‌تری وابوو.

لەبەرئەم تێکڵاوی هات و چووە، لەبەرئەوەش کەسەر سنوورەکان هەموو کورد بوون سنوور بەسیاسەت لە بەینیانا دانرابوو، هـەر دوو لە شـایەکـانی ئـێران و عـوسمانی ئـەیانویـست پیاوە گەورەکانی ئەو سنوورانە ڕاکێشن بۆلای خۆیان. بە تایبەتی پیاوێکی وەکو «کاکە ئەحمەدی شێخ» پیاوێکی والەخواترس و زانا ـ کە مەرکەزێکی زلی هەبوو لەبەرچاوی مەردمەکە ـ ئەوە هەر زۆرتر ئەیانویـست خۆیانی لێ نزیک خەنەوە. هەرچەندە ئەو لەبەر مەرکەزە دینیەکەی ـ کەداوای ئەوەی لێئەکرد شایەک و گەدایەک وەکو یەک بزانێ ـ بەڵام شای عوسمانی لەبەرئەوەکە لە وڵاتەکەیا بوو زیاتر حەزی ئەکرد بە نزیک بوونەوەی. ئەمانە هەموو کردبوویانە کارێ کـە «کـاکـەئەحمەدەی

سولەیمانی پایەیەکی گەورەی هەبێ لەلای هەموو کەسێکەوە.

ڕوژگار ڕوژەکانی خۆی پەڕەپەڕە ئەدایەلاوە، دەنگی زەنگی قەومییەت وردە وردە لە ولأتەکانا دەنگی ئەدایەوە، یا ئەزرینگایەوە.

لە ١٩٠٨دا بە ئیعتیباری ڕیزی بنەماڵەیی، شای عوسمانی ـ عەبدولحەمید ـ شێخ سەعیدی کوڕی سەیید محەمەدی کوڕی کاکە ئەحمەدی لە ولأتی ئەستەموڵەوە بانگێشتن کرد بۆ ئەوە بچێت بۆ ئەوێ و بە چوونەکەی ئەوەندەیتر لەبەر ناوبانگەکەی «کاکە ئەحمەد» بنەماڵە لە خۆی نزیکتر خاتەوە. «شێخ سەعید» بە خۆی و هەندێ لە خزمەکانی و دووکوڕەکەی ـ شێخ ئەحمەد و شێخ مەحمود ـ چوون و بە تایبەتی شێخ مەحمود چاوی بە کۆشکی پادشاهی کەوت و هەموو جۆرە پیاوانێکی ولأتی عوسمانی ـ لە پایتەختا ـ بینی و گوێچکەی زرینگایەوە لە دەنگی ئەو قەومیەتانە کە لە ولأتەکانی عوسمانی دا ڕوویان ئەدا، بێجگە لەمەش باسی کوردایەتی بەرەی بەدرخانیەکانی لەگەڵێ لەدیوەخانەکانی ئەستەمولا ئەکەوتە بەرگوێ.

کارەساتی موسڵ هەر لەو ساڵەدا کەبوو بەهۆی کوژرانی شێخ سەعید و شێخ ئەحمەدی کوڕی، کارێکی گەورەی کردەسەر دڵی هەموو کەسێک. کە پاشماوەی کوژرا و گەیشتەوە ولأتی سولەیمانی، دەستێکیتری خستە ناو دڵی خەڵکەوە. وەکو ئەمەی کرد؛ ئەوەشی بلأو کردەوە کە بەدرخانیەکان لە ولأتی خۆیان کۆششی دروستکردنی کێشوەرێکی کوردی ئەکەن. بوونی کێشوەرێکی کوردی بەرەبەرە لەمێشکی هەموو کوردێکا دەنگی ئەدایەوە.

[شێخ مەحمود] لەو دەورەدا نرخێکی بەرزی هەبوو؛ نرخی مەرکەزی دینی باوباپیری، نرخی بیروباوەڕی خۆی کە ولأتانی دیبوو، چاوی کردبووەوە، نرخی گۆشەی پیلان و شەڕوشۆڕ کە گەلێ جار لە ولأتەکەی خۆیا جەنگ و هەرای ئەکرد. ئەمانە هەموو «شێخ مەحمود»یان گەلأڵە کرد بۆ ئەوە کە دەست بدا بەنانەوەی شۆڕشێکی گەورەوە بۆ سەندنی سەربەخۆیی و ئازادی کورد.

وردەوردە تاپۆی جەنگی ١٩١٤ ـ ١٩١٨ نزیک بووەوە، لە تاپۆ دەرچوو فەساڵە ناشیرینەکەی هێرشی کردە سەر هەموو سوچێکی دنیا و هەموو لایەکی شڵەژان، خوێنی ڕژاوی مەیدانی جەنگەکانی ئەو شەڕە لە هەموو گۆشەیەکەوە لافاوی هەستان. ولأتی سولەیمانی ولأتی عوسمانی بوو، لەلایەکەوە ئینگلیز پەلاماری بۆ ئەدا، لە لایەکەوە ڕوس. لە هەر دوولاوە [شێخ مەحمود] کەوتە کۆڕی شەڕەوە؛ لە ١٩١٧ لە «کوت و عەممارە» لەگەڵ ئینگلیز شەڕی کرد، ناوێکی تری دەرکرد، هەرلە ئاخری ئەو ساڵەشدا لەولأتی پێنجوێن لەگەڵ ڕوسیش شەڕی کرد، ناوێکی تری دەرکرد.

لە ٣٠تشرینی یەکەمی ١٩١٨دا کە وەستانی شەڕی «موندوس» بلأو کرایەوە «عەلی ئیحسان پاشا»ی سەر لەشکری بەناوبانگی تورک لە موسڵەوە تەلگرافێکی بۆ شێخ مەحمود نارد کە بەناوی حکومەتی عوسمانییەوە حوکمداری ولأتی سولەیمانی بکات، ئەوێشی پێویستیش بێ لە

پارە و ئازۆخە بیداتێ، تەنانەت پێنج هەزار لیرەیەکیشی بۆ نارد. چ شێخ مەحمود، چ وڵاتی سولەیمانی ئەوەندەیان جەور و زوڵم لە دەستە و دایەرەی تورکەکان چاو پێکەوتبوو، هەموو لێی داخ بەدڵ بوون، «شێخ مەحمود» نرخێکی وای لە قسەکەی «عەلی ئیحسان پاشا» نەنا. بە پێچەوانەی ئەوە کە هاتەوە ناو شاری سولەیمانی، تابورێکی عەسکەری تورک لەوێ بوو، ئەم عەسکەرانە رێگەی گەڕانەوەیان بڕابوو چونکە ئینگلیزەکان کەرکووکیان لێگرتبوون، بۆ ئەوە خۆی لە ئۆباڵی ئەو تورکانە رزگار بکا، دایانێ بە ئینگلیزەکانی کەرکووک و خۆی بە نیازی بناغە دانانێک بۆ حکومەتێکی کوردی لە تشرینی دووهەمی ١٩١٨ هاتەوە ناوشاری سولەیمانی.

وڵاتی سولەیمانی بە تەواوی لە ژێر چنگی عوسمانی دەرچوو. «مێجەر نۆئێل» حاکمی سیاسی ئینگلیز، ئەو سەردەمە لە سولەیمانی بوو، «ویلسن» حاکمی گشتی عێراق بوو لە بەغدا. سیاسەتی ئەو رۆژەی وای پێویست بوو کە حکومەتێکی کوردی هەبێ. تازەش هاتبوونە وڵاتەوە، هێشتا خەڵک لێیان تێنەگەیشتبوون، ئەوان هەر بانگی ئازادی و چاوێری قەومە بەشخوراوەکانیان بە گوێی خەڵکا ئەدا!.

کە زانیان «شێخ مەحمود» وا پیاوێکی لێهاتوو و بە دەسەڵاتە، فیکریان هاتە سەر ئەوە کە یاریدەی بدەن. «شێخ مەحمود»یش دیارە بەبێ هیچ غایەلەیەک حەز ئەکا یەکێک هەبێ یاریدەی بدا و کوردستانێکی گەورەی سەربەخۆ درووست بێ!.

ئەم هەمووشتانە یەکیان گرت، ئەمجا «نۆئێل» بە قسەی «ویلسن» لە تشرینی دووەمی ١٩١٨ کۆبوونەوەیەکی لەناو شاری سولەیمانی کرد و بانگهێشتنێکی گەورەی بۆ هەموو پیاوماقوڵی ناوشار و سەرۆک عەشایەرەکان کرد و لەوێدا [شێخ مەحمود] ناونرایە «حوکمداری کوردستان». ئەوی پێویست بوو، بۆ ئەم حوکمدارییە هەمووی بە جێ هێنرا، [مێجەر نۆئێل] بوو بە «موستەشاری مەلەکی» و «مێجەر دانلیس» بوو بە موستەشاری عەسکەری بۆی و بۆ حکومەتی کوردستان. مانگانەی حوکمداریش ١٥ هەزار روپیە بێت.

ئەوا سولەیمانی بوو بە پایتەختی حکومەتی کوردستان و ئەم ناوە دڵخۆشیەکی گەلێ زۆری دا بە کورد، بەرەبەرە وڵاتانی پشدەر و خۆشناو و جاف و کوردەکانی ئەو دەورە بە بوونی حکومەتی کوردستان زیاتر دڵ قایم ئەبوون و سەریان لێئەدا. ئیتر سولەیمانی بوو بە ناوچەیەکی سیاسی کورد.

لێرەدا کە ئینگلیز یارمەتی حکومەتی «شێخ مەحمود»ی ئەدا، وەنەبێ لەبەر چاوی کاڵی کورد بووبێ، بەڵکو گەلێ مەبەستی هەبوو؛ لەولاوە وڵاتی سوریە و بەغدای هێشتا بۆ دانەمەزرابوو، بە تایبەتی حکومەتی عێراق هەر درووست نەبیوو، حەزی بەوە ئەکرد لە وڵاتی کوردەواری حکومەتێک بێ و ئەم حکومەتەش بە تەواوی وەیا بە ناتەواوی لەژێر چاوێری ئەوابێ، لەولاشەوە وڵاتانی [بەغدا و بەسرە] ئەگەر لەگەڵ سوریەدا نەبن بەیەک حکومەت، ئەمارەتێک بێ وەکو ئەمارەتەکانی تری ئەو وڵاتانەی عەرەبستان.

**لەمانەش هەموو زیاتر پاشەڵەقەی تورکەکان لە وڵاتانی ڕەواندز و «پەسوێ» تۆزی ئەکردا. ئەوان هێشتا دانی سولەیمانیان نەکەندبوو، وڵاتی سولەیمانی بە هیچ لەوان دانابچڕێ، مەگەر تەنیا بە بوونی حکومەتێکی کوردی نەبێ. مەسەلەی [موسڵ]یش کە لە بەینی سوێند خوارەکان و ئەولادا کێشەیەکی زۆری تێداهابووەوە ئەویش هەر لە کایەدابوو.***

*- بەڵێ لە کۆبوونەوەی تشرینی دووهەمی ۱۹۱۸ی ناوشاری سولەیمانی، «دانلیس» لەژێر لێوەوە ئەیوت لێرەدا مەبەست درووستکردنی حوکومەتێکی تەواو نییە بۆ کوردستان، بەڵکو مەبەست حوکمدارییە و هیچی تر. «ئیدموندس»یش لە کتێبەکەی خۆیا ئەڵێ: «ئینگلیزەکان هەرگیز نەیانوتووە کە حکومەت بۆ کوردستان درووست ئەکەن!».
ئەو دوو کەسە ئەم دوو قسەیە ئەخەنە بەرچاوی عالەمەوە، هەر بەکەش بۆ ئەوە کە خۆیان لەژێر ئۆبالێک دەرکەن.
[دانلیس] گەلێ مەبەستی هەبوو بەو قسەیە؛ یەکێک لەوانە ئەوەبوو کە ئەوان قسەیان دا بوو بە «فەلە»کان حوکومەتیان بۆ درووستکەن. فەلەکانیش دیارە گەلێ گیانبازتر بوون بەرانبەر بە ئینگلیز، ئەگەر هی ئەوان بیوایە، بوونی حکومەتێکی کوردی لەو وڵاتەدا ئیتر کەڵکێکی وای نەئەبەخشی بۆ ئینگلیز. کەچی لەلایەکی تریشەوە سەیری ئەکرد [عەلی ئیحسان پاشا] وا لەسەر چزە و پەیتا پەیتا قسە لە «شێخ مەحمود» ئەگێڕێتەوە کە حوکمداری وڵاتی کوردستان بکا. ئەگەر لێرەدا ئینگلیز واز دێنێ [شێخ مەحمود] بەناوی حکومەتی عوسمانییەوە ئەبێ بە حوکمدار و ئیش لە دەست ئەم دەرئەچێ. ئەگەر واز نابەنێ لەولاوە قسەی بە فەلە داوە و ئەزانێ فەلەش بۆ ئەو بەکەڵکترە تا کورد. وەکو کابرا وتی: «دارێکی بە دەستەوەیە هەر دوو سەری...!».
کەواتە ئەوەڵلا بەناوی حوکمدارییەوە دێنە مەیدانەوە و لە ڕواڵەتا دان بە حوکومەتی کوردستانا نانێ، ئەگەر لە ئاخرا حوکومەتی کوردستان سەری گرت، ئەوا ئەو پەیمان و قسانەی کە بە «فەلە»کانی داوە، ئەتوانێ پینەی بکا و بڵێت ئەوان زۆریان کرد لە ئێوە و منیش باشارم نەکردن و ئاو و هەواش لێستە بۆ درووسکردنی حوکومەتێک بۆ ئێوە دەست نادا!. خۆ ئەگەر حوکومەتی کوردستانیش سەری نەگرت ئەوە پڕ بەدەم بانگ ئەکا لەڵێ: باوکم من کەی وتوومە حوکومەت بۆ ئێوە درووست ئەکەم؟!. وەکو چۆن پاشماوەکانیان ئیتر هەمووجار ئەم قسەیەیان گرتبوو بەدەمەوە کەلەیانوت: ئینگلیز کەی وتوویەتی من حوکومەت بۆ ئێوە درووست ئەکەم؟!. ئەگەر ئەم قسەیانە ڕاستبێ کەوایان نەوتبوو، بێجگە لە درۆکە زیانێکی گەورەیان کرد، چونکە حوکومەتی [فەلە]شیان بۆ درووست نەبووا.
ئەمێنێتەوە سەر قسەکەی «ئیدمۆندس» کە ئەڵێ: «هەرگیز ئینگلیز نەیوتووە حوکومەت بۆ کورد درووست ئەکا».
[ئیدمۆندس] بەوناوەوە کە ئینگلیزێکە یادداشتێک ئەنووسێتەوە ئەمەشی هەر لە عالەمەتی کە لە پاش (۳۸) ساڵ بەسەر کارەساتا، کارەساتێکی واکەسەری نەگرت، ئەو تازە بێنێ ئەو قسەیە زیندوو بکاتەوە لە ئینگلیز و بڵێت: «ئینگلیز وتی بە کوردەکان حوکومەتتان بۆ درووست ئەکەم وکەچی نەشی کردا!». دانتان بە قسەیەکی وا لە پیاوێکی ئینگلیزەوە بەرانبەر بە

ئەمجۆرە شتانە هەموو پاڵیان بە ئینگلیزەوە ئەنا بۆ بوونی حوکومەتێکی کوردی لە سولەیمانیا و پاشان لە هەموو وڵاتی کوردەواری ئەو ناوە دا، حوکومەتی شێخ مەحمود، یا لە راستیا بەمەی ئەزانی، یا هەندێ لە دەور و پشتەکانی نەیانئەویست ئیش بەمجۆرە بڕوا.

ئیش هەر جۆر بوو، [شێخ مەحمود] کەوتە سەر ئەوە کە دەستی ئینگلیز لە حوکومەتی کوردستانا نەیەڵێ، بەڵام هاتە پێشەوەی فەرمانەکانی [شێخ مەحمود] جۆرێکی تری لە ئینگلیز ئەگەیاند؛ ئەوەی تێئەگەیاندن کە گۆیا [شێخ مەحمود] خەریکە ئەوان دەربەڕێنێ و دەستی تورک لە وڵاتی «سولەیمانی» دابخاتەوەکایە. ئەم گەنە باوەڕە بوو بە هۆی ساردیی بەینی ئینگلیز و حوکومەتی کوردستان.

هەرچەندە سەرۆکی عەشرەتەکانی وڵاتی سولەیمانی و گەلێکیش لە هینەکانی کوردەواری ئێران مەزبەتەیەکی گەورەیان لە سولەیمانی کردەوە لە لایەن ئەوەوە کە [شێخ مەحمود]یان قبووڵ کرد بە حوکمداری کوردستان و دایان بە ئینگلیز، بەڵام کە ئینگلیز سەیری کردەوەکانی تری حوکومەتی کوردستانی ئەکرد نەئەچووە دڵیەوە ئەو مەبەستەی ئەو هەیەتی بە حوکومەتی کوردستان، حوکومەتی کوردستان ئەوەی بۆ پێک بێنێت.

لەبەرئەمە کەوتە تەقە لە «شێخ مەحمود» و وردە وردە جاری مانگانەکەی کەم کرایەوە، ئەمجا کەوتە زرنگاندنی ناوەکەی لەناو عەشایرەکانا، لەمەوە کەوتە سەر ئەو فیکرە کەناوی حوکومەتی کوردستان هەر بەتەواوی هەڵبگرێ، پڕوپاگاندەیان لەناو عەشایرەکانا بۆ ئەم مەبەستە کەوتە جرت و فرت کردن، جەنابی «مێجەرسۆن»یش لەو سەردەمانەدا کە لە وڵاتی سولەیمانی بوو، ئەویش بۆ تێکدانی ئەو جۆرە حوکومەتەی [شێخ مەحمود] بە هەموو هێزێکیەوە کەوتە ئیشکردن، سەرەرای ئەوەش دەستی دا بە جەوروستەمێکی واوە کە ئەوسەری دیار نەبێتەوە. مەردم هیوای ئەوەیان بوو کە ئینگلیز رزگارکەری قەومە بچووکەکانە، وا ئەمانیش رزگاریان بوو، کەچی زوڵم و زۆری ئەو، گەلێ لەهی دەوری تورکەکان خراپتربوو!.

ئەمجا [شێخ مەحمود]یش کە ساردی بەینی خۆی و ئینگلیزی بە تەواوی بۆ دەرکەوت ناچار

---

ئینگلیز شتێکی زۆر دوورە. ەڵێ ئینگلیز کارەسانی عیلمی بەجوانی باس ئەکەن، بەڵام لە رەوشتی ئینگلیز نییە کە پشتی بەک بدەن بە عەرزا! ئەگەر رۆژ لەوەدا بوایە کە حوکومەتە کە سەری بگرتایە، ئەو وەختە ئەوەک یەکێ، بەڵکو هەموویان هاواریان ئەکرد کە ئێمە دروستمان کردووە!.

لەگەڵ ئەمانەشدا کارەسات و مەنتق هەموو پشتیوانی ئەوە ئەکەن کە ئینگلیز یا [دانلبس] بە تەواوی دانیان نابێ بەوەدا کە حوکومەتی کوردستانی [شێخ مەحمود] ئەبێ بێ و ئەو زروفانەی پێشرو کە باسکران هەموویان پاڵ بە ئینگلیزەوە ئەنێن کەدان بە حوکومەتی کوردستانا بنێ و بە ئاشکراش بیڵێ، بەڵام پاشە رۆژ بە جۆرێکی تر هەڵیبگێڕنەوە، ئەمە شتێکی ترە، وەکو هەڵیانگێڕایەوە و هەموو وەخت ئەڵێن قسەی وامان نەکردووە و نەوتووە!.

ئەویش کەوتە خۆی و کەوتە قسەکردن لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتەکانا، مەبەستیشی لەمەدا ئەوەبوو بزانێ ئاخۆ کامیان لەلای ئەون و کامیان لای ئەو نین تا بتوانێ ئەمجارە شۆڕشێکی راستەقینە بەرانبەر بە ئینگلیز بنێتەوە.

ئەمە و لە مایسی ۱۹۱۹شدا، خەبەری ناردبوو «مەحمود خانی دزلی» کە بەناوی ـ زیارەتی مەرقەدی کاکە ئەحمەد ـ ەوە بە لەشکرەوە بێت بۆ سولەیمانی، ئەمانەی هەموو کرد، [مەحمود خان]یش بە لەشکرێکی کۆکەوە خۆی گەیاندە ناوشار، ئەمجا لە ۲۱ مایسی ۱۹۱۹دا بە هەموو مەعنایەک سەری هەڵدا و ئەوکاربەدەستە ئینگلیزانەی کە لە سولەیمانی بوون،گرتنی و شۆڕشی خۆی بەرانبەر بە ئینگلیز بلاو کردەوە. لەولاشەوە لە لایەن هەورامیەکانەوە هەڵەبجە گیرا و ئەم ناوچانە هەموو کەوتنە ژێر فەرمانی حوکمداری [شێخ مەحمود]ەوە.

ئینگلیزەکان بەم ئیشە ئیجگار شڵەژان و بە تەواوی لەگەڵ حکومەتی کوردستانا لێک ئاشکرابوون. ئەمجا لە رێگەی کەرکوکەوە لەشکرێکی زۆریان بۆ گرتنی شاری سولەیمانی و لەناوبردنی حکومەتی کوردستان نارد.کە حوکمدار ئەم خەبەرەی زانی، ئەمیش لەشکرێکی نارد بۆ بەربەستکردنی ئەولێشاوە. هەرجارە لەشکری کوردستان سەرئەکەوت؛ شکان و گەڕانەوە ئەبوو بە بەشی لەشکری ئینگلیز.

لێرەدا ئینگلیزەکان بە تەواوی کەوتنە خۆیان، بەو شکانی یەک لەسەر یەکەیان تووڕە ببوون، کەوتنە سەرئەوە کە ناوی خۆیان بسێننەوە. جارێ لەشکرێکیان نارد بۆ وڵاتەکانی خانەقی، کفری وگەرمیان کە نەیەڵن کوردەکانی ئەو ناوە لەگەڵ حکومەتی کوردستان یەک بگرن. خۆیشی لەملاوە بە لەشکرێکی پڕهێز و هەموو جۆرە چەکێکی هەوایی و سەرزەویەوە وەکو لێشاو ڕو بە «چەمچەماڵ» و «دەربەندی بازیان» و «تاسلوجە» بەڕێ کەوت بە نیازی گرتنی سولەیمانی.

لەشکری کوردستان لەژێر سەرکردەیی «شێخ مەحمود» خۆیا لە تاسلوجە بەرەنگاریان بوون، بە جۆرێکی زۆر پیس شکاندنیان و بەرە و دوا بوونەوە، لەشکری «شێخ مەحمود» دەس لەسەرشان راویان نان تاکردیانن بە دەربەندی بازیان دا، لێرەدا یارمەتیەکی فراوان لە کەرکوک و موسڵەوە گەیشتە فریایان و خۆیان گرتەوە.

لەشکری ئینگلیز وەکو خۆڵ و رشتە بەسەر یەکا هەڵدرا بوونەوە؛گورگە و سیک و بیاو خور و [مەغوّل]، تا چاوکاری ئەکرد دەشت و دەری پڕ کردبوو. هەرچەندە لەشکری «شێخ مەحمود» بەرانبەر بەو لەشکرە هەر زۆر هیچ بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا دیسان گومان لەسەر کەوتنی لەشکرەکەی ئەمانا هەر نەبوو. ئەوەندە هەبوو وەکو ئەڵێن بەشارەزایی و پێشڕەوی «موشیر حەمەی سلێمانی هەمەوەن» دەستە ئینگلیزێکی زۆر لە کلکەی شاخەکەی دەربەندەوە هاتن بەم دیوا ـ دیوی سولەیمانی ـ و پشتیان لە لەشکری کوردستان بڕیەوە. لەشکری لای شێخ مەحمود بەمەی نەزانی، کاتێک پێیان زانی بەر و دوایان لێگیراوە!.

شەڕ گەرم بوو، هەرچەندە بەرەی شێخ جەنگێکی مەردانە و بە کوڵیان کرد بەڵام لەبەرئەوە لە

هیچ لایەکەوە دەرفەت نەمابوو لە ١٩١٩/٦/٩ لەشکر شکا و «شێخ مەحمود» بریندار بوو کەوتە بن بەردێک کە ئێستە پێی ئەڵێن «بەردە قارەمان». ئینگلیزەکان ئەهاتن بەناو بریندار و کوژراوەکانا ئەگەڕان و ئەیانویست [شێخ مەحمود]یان دەستکەوێ. هەر بەشارەزایی «موشیر» شێخیان ناسیەوە و بردیان. هەر بەو شاڵاوەوە هاتن سولەیمانیشیان داگیر کردەوە.

کە [شێخ مەحمود] گیرا، بردیانە بەغدا، لەپاش بەینێک لەگەڵ «شێخ حەمە غەریب» دا دران بە دیوانی عورفی ـکە ئەندامەکانی هەموو ئینگلیز بوون ـ لە پاش موحاکەمەیەکی رواڵەتیی، لە ٢٥ی تەموزی ١٩١٩ حوکمی خنکاندنی شێخیان دا و پاشان حوکمەکەیان گۆڕیەوە بە حەپسی هەتا هەتایی و لەگەڵ «شێخ حەمە غەریب» ناردیانن بۆ «ئەندامان» لە هندستان. بەمجۆرە پەردە بەسەر دەوری یەکەم حوکمداریی، حوکمداری کوردستانا دادرایەوە. لەمڵاشەوە وڵاتی سولەیمانی و دۆستەکانی شێخ مەحمود کەوتنە گێژاوی حوکمی نارەوای ئینگلیزەوە، ئەوەی پێی ئەکرا رێگەی دەشت و دەر و شاخەکانی ئەگرت و ئەوەش کە پێی نەئەکرا، لەژێر جەوری ئینگلیزا ئەتلایەوە.

* * *

ئەوەی کە شایانی زیاتر باس لێوەکردن بێ لەم دەورەی حوکمداری یەکەمی شێخ مەحمودە دا ناردنی ئەو یادداشتە بوو بۆ کۆنگرەی «ڤەرساری» لەلایەن داواکردنی حقوقی کوردەوە.

دەورەی حکومەتی عوسمانی و ئەستەمۆڵ هەتا ئەهات پیرتر و بێ‌فەڕتر ئەبوو، پیاوە دیکتاتورەکانی بەرانبەر بەو قەومانە کە کەوتبوونە ژێر سایەی ئیمپراتوریەتەوە هەتا ئەهاتن خراپە و خراپەکارییان زیاتر ئەکرد، قەومەکانی ژێر بەیداخ هەموو دەمێ لە کۆششی ئەوەدابوون کە چارێک بۆ رزگارکردنی خۆیان بدۆزنەوە.

یەکێک لەو قەومانە قەومی «کورد» بوو، ئەمانە بە تەواوی بەتەنگ هاتبوون. پایتەخت ئەستەمۆڵ بوو، شوێنی گەلێ پیاوی گەورە و ناوداری هەموو قەومەکان بوو، لە کوردەکانیش زۆر کەس لەوێ بوون. ئەمانە کەوتنە سەر ئەوەکە کۆمەڵێکی سیاسی دامەزرێنن و لەژێر سێبەری ئەم کۆمەڵەدا داوای بەش خوراویی کورد بکەن.

لە ١٩٠٨دا گەورە پیاوەکانی کوردی ئەو سەردەمە: «ئەمین عالی بەدرخان، فەریق شەریف پاشای کوڕی سەعید پاشا، شەهیدی وڵات شێخ عەبدولقادر، داماد ئەحمەد ذولەکفەل پاشا» بەناوی «کۆمەڵی بەرزی و سەکەوتنی کورد»ەوە کۆمەڵێکیان دانا و ئەمانە کەوتنە ئیشکردن. دیکتاتۆریەتی تورانی لەپاش بەینێک کۆمەڵەکەی هەڵگرت، ئەوەندە هەبوو ئەندامانی کۆمەڵ بە جۆرێکی نهێنی هەر وازیان لە ئیشکردن بۆ کورد نەهێنا.

جەنگی ١٩١٤ ـ ١٩١٨ بەسەراهات، سەرەتا حکومەتی عوسمانی لای وابوو بە پشتیوانی ئەڵەمانەوە سەر ئەکەوێ و ئەو وەختە بە ئارەزووی خۆی ئەکەوێتە کوشتن و بڕینی قەومەکانی ژێردەستەی ـکە دوژمنی هەرە گەورەی ناو قەومەکانیشی قەومی کورد بوون ـ

شەڕ دوایی هات و سوێندخوارەکان سەرکەوتن و بەڵکو موتارەکەش کەوتە ناوەوە. لە ئیتحادیەکان حکومەتێکی مامناونجی لە [ئەستەمۆڵ] دامەزرا، قەومە بەشخوراوەکان ـ کە یەکێک لەوانە کورد بوو ـ پشوویەکیان پیاهاتەوە، بە تایبەتی پیاوەکانی کورد دیسان سەریان بەرز کردەوە و کەوتنەوە ئیشکردن، هەر ئەوەندە نەا، بەڵکو بە ئاشکرا کەوتنەوە داواکردنی سەربەخۆیی و ئازادی کورد.

لێرەدا «بابی عالی» کەوتە دانانی دەستەیەکی وزاری بۆ جێبەجێ کردنی مەسەلەی کورد، هەیئەت لەم ئەندامانە درووست بوو:

«ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری شێخولئیسلام، عەبوق پاشا ـ نازری ئەشغال، عەونی پاشا ـ نازری دەریایی». لە کۆمەڵی بەرزی کوردستانیش هەیئەتێک درووست بوو کە ئەندامەکانی: «ئەمین عالی بەدرخان، موراد بەدرخان، شێخ عەبدولقادر ئەفەندی» بوون. ئەمانە تێکرا لە [بابی عالی] کۆبوونەوە و دەربارەی کورد ئەم بڕیارانەی خوارەوەیان دا:

١ـ کوردستان سەبەرخۆیی زاتی بدرێتێ بەو مەرجە کە لەژێر سێبەری [عوسمانی]دا بمێنێتەوە.

٢ـ بە زوویەکی زوو ئەم سەربەخۆییە بڵاو بکرێتەوە و چی بۆی پێویستە جێبەجێ بکرێ.

ئەم بڕیارانە درا، بەڵام رۆژ و مانگ بەسەر ئەچوو و هیچ بەرێکی دیار نەبوو. لە ئاخرا «کۆمەڵی بەرزی کورد»، «کۆمەڵی جێبەجێ کردنی کاروباری کۆمەڵایەتی»، «کۆمەڵی سەربەخۆیی کورد» ئەمانە هەموو کۆبوونەوە و «شەریف پاشا»یان هەڵبژارد ـ کە ئەو سەردەمە شەریف پاشا لە پاریس بوو ـ بۆ ئەوە بچێ لە کۆنگرەی ئاشتی قسە لە باس وخواس و سەربەخۆیی کوردەوە بکا. لە پاش دوان و قسەکردن؛ قسەی هەموو کۆمەڵە کوردیەکان هاتە سەرئەوە کە:

١ـ شەریف پاشا لەگەڵ «بوغوس نەوبار پاشا» سەرۆکی نێراوە ئەرمەنییەکان لە [پاریس] یەک بگرن و بەجووتە قسە لە کاروباری کورد و ئەرمەنەوە بکەن.

٢ـ ئیشێکی وا بکەن کە ئەم بەندانەی خوارەوە تێکەڵاوی پەیمانی «سیڤەر» بکرێ ـ کە ئەو پەیمانە لە ١٠ی ئاغستۆزی ١٩٢٠دا کرابوو؛ بە حکومەتی عوسمانیش ئیمزا کرابوو ـ. بەندەکانیش بەندی ٦٢،٦٣،٦٤ بوون کە ئەمانەن:

بەندی ٦٢

«هەریەکە لە حکومەتەکانی فەرەنسە، ئینگلیز و ئیتالیا سەرو ئەندام ئەنێرن و ئەم ئەندامانە لێژنەیەکی سێ قۆڵی لە ئەستەمۆڵ پیکدێنن، بە شەش مانگ دوای بەجێهێنانی ئەم پەیمانە سەربەخۆییەکی ناوچەیی ئامادە ئەکا بۆ ئەو شوێنانە کە کوردی تیا دانیشتوون و کەوتوونەتە رۆژهەڵاتی «فورات» و جنوبی رۆژئاوای ئەو سنوورە کەلە دوایی دائەنرێت بۆ ئەرمەنستان و

نێرراوی کورد لە پاریس

زنەڕاڵ شەریف پاشای سەعید پاشا

شیمالی ئەو سنوورە کە «سوریە» و «مەزۆپۆتامیا» لە یەک جیا ئەکاتەوە. ئەمەش بەپێی ئەو تەعلیمات و دەستوراتانە کە لە بەشی ٢ و ٣ بەندی ٢ی ژمارە ٢٧دا باسکراوە.

بەڵام ئەگەر هاتوو ئەم ئەندامانە لە هەندێ شتا، یا لە هەمویا قسەیان یەکی نەگرت، هەریەکەیان ئەبێ لەملایەنەوە حکومەتەکەی خۆیان ئاگادار بکەن. هەروەها پێویستە لەسەر ئەم لیژنەیە کاتێ کە ڕێککەوتن لەسەر هەموو شتێک باسی پارێزگاری حقوقی قەومە کەمەکانی - وەکو ئەو نەستوورییانە کە ئەکەونە ناو ئەو وڵاتەوە - بکەن و حقوقی ئەوانیش لەناو ئەو هەرێمەدا بپارێزرێت.

بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەیەکی پێنج کەسی کەئەندامەکانی لە بەریتانیا، فەرەنسە، ئیتالیا، ئێران و کورد بێ درووست ئەبێ - ئەمەش ئەگەر پێویست بوو - بۆ پشکنین و بڕیاردان لەو سنوورانەدا کە بە پێی ئەم پەیمانە بۆ تورکیا دانراوە و ئەنووسێت بە ئێرانەوە».

بەندی ٦٣

«حکومەتی عوسمانی لە ئێمڕۆوە گفت ئەدا کە لەو وەختەوە پێی ئەوترێ، تا ماوەی ٣ مانگ قسەوباسی هەر دوو ئەو لیژنەیە کە لە بەندی ٦٢دا باسکرا، بەڵێن و بڕیاری لەسەر بدا».

بەندی ٦٤

«لەپاش ئەوە کە ئەم پەیمانە درووست ئەبێ و بڕیاری لەسەردرا، ئەگەر لە ماوەی ساڵێکا ئەو کوردانەی کە کەوتوونەتە ئەو هەرێمانەوە کە لە بەندی ٦٢دا باسکرا، داوایان لە «کۆمەڵی قەومەکان ـ عصبةالأمم» کرد کە زۆرتری کوردەکانی ئەم ناوچەیە ئەیانەوی لە تورکیا جیا ببنەوە و سەربەخۆ بن، وە ئەویش ـ عصبةالأمم ـ دانی بەمە دانا کە ئەمانە ئەم شایستەییەیان تیا هەیە، تورکیا هەر لە ئێستەوە لەسەر ئەو راسپێری «عصبە»یە بەڵێن ئەدا کە دەست لە هەموو ئەو حقوقانەی هەڵگرێ کە ئەکەونە ئەو ناوچانەوە.

ئەم دەست هەڵگرتنی حکومەتی تورکیایەش لە «حقوقەکانی» بە دوور و درێژی لە گفتوگۆ و کۆبوونەوەیەکی تایبەتیا ـ کە ئەگیرێت لە بەینی ئەو و سوێندخوارەکانا ـ باس ئەکرێت. دوای ئەم دەست هەڵگرتنەش کە تورکیا دەستی هەڵگرت، هیچ بەر هەڵستێک لەلایەن سوێندخوارەکانەوە ناخرێتە بەرچاو بەرانبەر بە ئارەزووی کوردەکانی وڵاتی «موسڵ» ئەگەر بیانەوێ لەگەڵ ئەو کوردانە دا کە کەوتوونەتە وڵاتی تورکیا و سەربەخۆییان وەرگرتووە تێکەڵاو ببن و بچنە ناو ئەو جغزی حکومەتەیانەوە.».

* * *

ئەم پەیمانی موئتەمەری «سیڤەر»» لەوانە بوو پشتی تورکی شکاند، بە تایبەتی کە ئەو بەندانەشی تێخرا، ئەوەندەی‌تر ئاژاوەی فیکری لە تورکیادا نایەوە. وەکو بۆمان دەرکەوت درووستکردن و کۆشش کردن بۆ ئەم بەندانە و بۆ کۆڕی ئاشتی، کوردە دانیشتووەکانی وڵاتی ئەستەموڵ و وڵاتەکانی جزیرە و بۆتان بوون. وڵاتی سۆران ئەو سەردەمە دەستیان نەیانئەگەیشتێ. لە دەوری یەکەم حوکمداری [شێخ مەحمود]دا لە سولەیمانی کۆڕێک بەسترا، زۆر لە سەرۆکی عەشرەتەکان و «مێجەر نۆئیل»یشی تیابوو، مەزبەتەیەک رێک خرا؛ کەئەمانیش ـ واتە کوردی عێراق و سۆران ـ وەکو کوردەکانی ئەو وڵاتە، ئەوا «شەریف پاشا»یان کرد بە نمایندەی خۆیان بۆ داواکردن مافی کورد لە کۆڕی ئاشتی و موئتەمەری ئاشتیدا.

ئەم مەزبەتەیە درایە دەست «سەیید ئەحمەدی بەرزنجی» و «رەشید کابان» کە بیبەن بۆ [پاریس] و بیدەن بە شەریف پاشا. نێراوەکان لە رێی موسڵەوە بە زێ کەوتن بۆ پاریس. کە گەیشتنە «حەڵەب» لەوێ مانەوە و ڕێیان نەدرا بۆ چوونە [پاریس]. بە خۆیان و مەزبەتەیانەوە گەڕانەوە بۆ وڵاتی «سولەیمانی».

لەگەڵ ئەمانەشا داخەکەم چ کۆڕی ئاشتی و چ دەوڵەتە گەورەکان هەر شتێک کە وتیان هیچیان بەجێ نەهێنا و هەمووی هەر مەرەکەبی سەر قاقەز بوو لەبارەی حقوقی کوردەوە!.

* * *

چۆنیەتی وڵاتی سولەیمانی لەپاش برانی شێخ مەحمود بۆ «هندستان» بە تەواوی تێکچوو؛ لەلایەکەوە لە ئاکرێ و ئامێدی ئاژاوە دەستی پێکردبوو، لەملاوە لەوڵاتی هەورامان و مەریوان و

بانە دیسان هەرا هەڵسابوو، «ئۆزدەمیر»یش ـ پاشماوەی تورک ـ لە وڵاتی ڕەواندز تۆزی ئەکردا. لە لای سابلاخ و ورمێوە «سمایل ئاغای سمکۆ» دەستی پێکردبوو. شەڕی ١٩١٤ ـ ١٩١٨ هەرچەندە بڕابووەوە بەڵام گێچەڵ و پاشەلەقەی هەر لەناوابوو، هێمنی و ئاسایش دانەمەزرابوەوە. بە تایبەتی هەستێکی کوردایەتی لە هەمولایەکی کوردەواری یەوە پەیدا بوو.

ئەمانە و مانەوەی «ئۆزدەمیر» لە وڵاتی ڕەواندز سەریان لە سیاسەتی ئینگلیز تێکدابوو لە وڵاتا، بە جارێ چوار چاو ببووەوە. نە ئەمەبوو لابکاتەوە بەلای «حاجی شەعبان ئاغا»ی [illegible] یدی و «فارس ئاغا»ی زێباریەوە، ـ کە لەو وڵاتانەدا ئاگری ئاژاوایان ناوەتەوە ـ نە ئەمەبوو لا بەلای «ئۆزدەمیر»ەوە بکاتەوە کە بە خۆی و لەشکرێکی تورکەوە لە وڵاتی ڕەواندز و دەوروبەریا خەریکی پڕوپاگاندە بوو بۆ [تورک] و خەریکی ئەوەبوو کە کوردەکان هەڵگێڕێتەوە و بیانکا بە سەربەتورک.

ئەمە لە «عێراق»دا! لە ئێرانیشا بەرەی سەردار ڕەشید و جافرسانی لهۆن و مەحمود خانی دزڵی و مەحمود خان کانی سانان و حەمەخانی بانە، ئەمانە هەریەکە لە لایەکەوە ئاژاوەیەکیان ناوەتەوە و زرنگەی تەلی دڵی زۆریشیان بەلای کوردایەتی دا دەنگ ئەداتەوە. وڵاتی سولەیمانیش بۆ برانی [شێخ مەحمود] ئەوە هەر زۆر زۆر دڵ بریندارن و هەر ڕۆژە نە ڕۆژێک لەلایەکەوە کارەساتێک ئەقەومێ!.

ئەم شتانە هەموو ئینگیزیان ناچار کرد بەوە کەدان بە واقیعدا بنێ و [شێخ مەحمود] لە هندستانەوە بگێڕێتەوە بۆ سولەیمانی و سەر لە نوێ شێخ مەحمود بیێتەوە بە حوکمدار. هەر چەندە لەماوەی بەینی ئەم دوو جاری حوکمداریەی دا حکومەتێکیش لە [بەغدا] بەناوی حکومەتی «فەیسەڵ»ەوە دانرابوو، بەڵام وڵاتی کوردستان بەبێ «شێخ مەحمود» هەر نەچوو بەڕێوە.

لەو ماوەیەدا کە ئینگلیز کاروباری سولەیمانی ئەبینی و شێخ مەحمود لە [هندستان] بوو، لە ٢٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠دا بەناوی حکومەتی عێراقیەوە یەکەم وەزارەتی [سەیید عەبدولڕەحمانی نەقیب] لە بەغدا دامەزرا و پێی ئەوترا «حکومەتی وەختی». لەو وەختەدا «مەندوبی سامی» بەغدا ئەمەی لە وەزارەت گەیاند کە ئەیەوێ خۆی چاوێری وڵاتی سولەیمانی بکا.

دەنگی گەڕانەوەی [شێخ مەحمود] بۆ سولەیمانی بڵاو بووەوە، دەستە و دایەرەکەی ـ کەتا ئەو سەردەمە هەرسەریان بۆ ئینگلیز دانەنەواندبوو بەناوی چەتەیەتیەوە هەر بەشاخ و داخەکانەوە بوون ـ هەموو کۆبوونەوە و هاتنەوە بۆ سولەیمانی. نەوەک هەر ئەوان بەڵکو لە هەمولایەکەوە و لە هەموو عەشرەتەکانەوە وڵاتی سولەیمانی بۆ هاتنەوەی «شێخ مەحمود» بوو بە پورەی هەنگ و بوو بە دەورێکی زۆر تەئریخی لە ژیانی سولەیمانیدا! بوو بە ڕۆژێک کە ڕۆڵەکانی کوردستان هەموو کۆئەبنەوە بۆ پێشوازی مەلیکی کوردستان!.

[شێخ مەحمود] لە پاش نزیکەی سێ ساڵی دیلێتی، لە ئاخر و ئۆخری ١٩٢٢دا گەڕایەوە و هاتە بەغدا و لەوێوە بەڕێ کەوت بۆ سولەیمانی، پێشوازی و ئیستیقباڵ بەرەبەرە بۆ پیریەوە چوونی «شێخ مەحمود» لە سولەیمانی دەستی پێکرد، سەرتای پێشوازیکەران گەیشتە بەغدا، هەتا ڕوبەڕوی سولەیمانی ئەبوونەوە دنیای شادمانی زیاتر ئەبوو، ئەو رۆژە چ رۆژێک بوو کە [شێخ مەحمود] چووەوە ناوشای سولەیمانی؟! هەرلە ئەیلولا بوو شادی چونەوەی «شێخ مەحمود» بۆ سولەیمانی، هەرلە ئەیلولیشا بوو ناکامی سولەیمانی، بەڵام ئەویان لە ١٩٢٢دا بوو، ئەمیان لە ١٩٣٠دا.

[شێخ مەحمود] حوکمداری کوردستان لە بەرگی مەلیکی دا

وەختی خۆی ئەوەبوو «مەندوبی سامی» لە وەزارەتی نەقیب دا هەندێ قسەی لە بارەی ئیدارەی سولەیمانی‌دا کردبوو، ئەم قسانە ببوونە مایەی دڵ رەنجاندنی سولەیمانی و دەستەی [شێخ مەحمود]. کە شێخ مەحمود گەڕایەوە بۆ سولەیمانی، ئینگلیز ئەیەویست پینەی ئەو قسانەی خۆی بکا و ئەو ساردیە لەبەینی خۆی و سولەیمانی‌دا نەیەڵێ. بڕیاری‌دا لەشکرەکەی لە [سولەیمانی] بکێشێتەوە و دەستەیەک بۆئیدارەی سولەیمانی دابنێ، دیارە ئەمەش لەژێر فەرمانی «شێخ مەحمود»دا ئەبێ.

لە ١٤ ئەیلوولی ١٩٢٢دا کۆنگرەیەکی ناوچەیی درووستکرا و «شێخ مەحمود» بوو بە سەرۆکی ئەو کۆنگرەیە، لەپاش چەند رۆژێک لە تشرینی دووەمی ١٩٢٢دا ناوی خۆی نایە«مەلیکی کوردستان» و لە راستی‌دا ناوی مەلیکی وەرگرت، ئاڵای سەربەخۆیی کوردستان لەو رۆژەدا لە شاری سولەیمانی هەڵکرا و یەکەم وەزارەتی کوردستان بەمجۆرەی خوارەوە دامەزرا:

| | |
|---|---|
| شێخ قادری برای شێخ مەحمود | سەرۆکی وەزیرەکان و سۆپاسالار* |
| عەبدولکەریم عەلەکە | وەزیری دارایی |
| مستەفا پاشای یامولکی | وەزیری فەرهەنگ |
| شێخ حەمە غەریب | وەزیری ناوەوە |

* - ئەم ناوانە لە رۆژنامەی «بانگی کوردستان»ی ئەو دەورەدا ـ کەلە سولەیمانی دەرئەچوو ـ لەباتی وەزیر، رەئیسی داناوە. بەڵام مەبەست لە رەئیس، وەزیری ئیستیلاحی ئێستەیە

| | |
|---|---|
| سالح زەکی صاحبقڕان | وەزیری هێزی میللی |
| ئەحمەد بەگی فتاح بەگ | وەزیری گومرک |
| حەمە ئاغای ئەورەحەمان ئاغا | وەزیری نافیعە |
| سەیید ئەحمەدی بەرزنجی | سەرۆکی ئەمنی عام |
| حاجی مەلا سەعید | وەزیری دادگاه |
| سدیق ئەلقادری | موفەتشی هەموو حکومەتی کوردستان |

بەمجۆرە حکومەتی کوردستان و وەزارەتی دامەزرا، لەپاش ئەمە وردە وردە کاروباری ئیدارەی حکومەت رێکخرا، دایەرەکان دەستیان کرد بە ئیشکردن، نووسینی دایەرە و دەرەوە بە کوردی دەست پێکرا، پولی (تەمر) پۆستە دەرهێنرا. بزنانە و مەڕانە وەرئەگیرا و پوسولەی ئەدرا. سەرۆکی هەشرەتەکان سەریان ئەدا لە پایتەخت و دڵخۆش بوون بەم حکومەتە.

ئەوەندە هەبوو ئەم [ئیدارە] و حوکمداری و پادشایەتیە هەر بۆ سولەیمانی ـ واتە بۆ لیوای سولەیمانی ـ بوو، دیارە [شێخ مەحمود] ئارەزوویەکی تری هەبوو ـ ئارەزووی سەربەخۆیی هەموو کوردستانی هەبوو ـ بە ناوچەی سولەیمانی رازی نەئەبوو. ئەمجا کەوتە سەر داواکردنی هەموو شارەکوردەواریەکانی تری عێراق و ئەیەویست هەموویان بکەونە ژێر ئاڵای کوردستانەوە.

لەولاشەوە «ئۆزدەمیر» کە ئاوازی حکومەتی کوردستانی بیستبوو بە هەموو جۆر ئەیەویست خۆی لە مەلیک نزیک خاتەوە، کەوتە فروفێڵی «میکیافلی» و لەراستیدا خۆی لێ نزیک خستەوە و لەگەڵ مەلیکدا دەمی راسپێریان گەیشتە یەک!.

لەو سەردەمەدا «مێجەر نۆئێل»ی موستەشاری شێخ مەحمود و وەکیلی مەندوبی سامی بەریتانیا لە سولەیمانی بوو، هەستی کرد کە شتێک لە کایەدایە. ئەم هەستەشی لەبەرئەوە بوو کە گەلێ بیروباوەڕی جیاجیا لە سولەیمانی پەیدا ببوو؛ شێخەکانی بەرزنجە لەلایەکەوە لەبەرئەوە [شێخ مەحمود] مەلیکە و لەبەرەی بەرزنجەییە، ئەیانویست هەچ ئیش وکارێک هەیە ئەبێ لەژێر دەستی ئەوانابێ، نەوەک هەر ئەوەندە بەڵکو بە هەموو جۆر ئەیانویست حوکم بکەن و ئەشیان کرد، هەریەکە لەلایەکەوە ئاغەیەک بوو بۆ خۆی!. کەس خەتی کەسی نەئەخوێندەوە.

لەلایەکیترەوە هەندێک لە ولاّت دیدەکانی سولەیمانی لەو باوەڕەدابوون کە سیاسەت و خزمایەتی گەلێ لێک دورن، بەڵکو ئەوان لەسەر ئەو مەفکورەیە بوون کە مەیدانی سیاسەت ئەوەیە لە هەر لایەکەوە بای هات پیاو ئەبێ لەولایەوە شەن بکا!. لە باوەڕی ئەوانا تێکچوونی دەوڵەتی عوسمانی و هاتنی ئینگلیز بۆ ئەو ولاتە، ئەمە دەروویەک بووە لە کورد کراوەتەوە، چونکە ئەگەر ئینگلیز نەبوایە ئەوان نەئەگەیشتن بەو سەربەخۆییە!. کەواتە تا ئاخر هەناسە ئەبێ لەگەڵ ئینگلیز بن و نابێ قسەی بشکێنن.

هەندێکی تریش هەر بە بیروباوەڕێکی پێشین لەسەر ئەو رایەبوون کە ئەبێ حکومەتی تورک لەبەرئەوە کە ئیسلامە؛ بێتەوە و ئەبێ لەژێر فەرمانی [خەلیفە] دا بن!. هەر دوو دەستەکەش

بەجارێ کە کردەوەی شێخەکانی بەرزنجەیان ئەبینی لە وڵاتی سولەیمانی بێزیان لە خۆیان و لە ئیدارەی سولەیمانی ئەهاتەوە.

«شێخ مەحمود» خۆیشی پیاوێک بوو لە چاکە بەولاوە هیچی تری نەئەویست، هەرچەندە [مەلیک] بوو، بەڵام لە رەوشت و هەڵسوکەوتا بە تەعبیری ئێستە ئەو پەڕی دیموکراتی هەبوو، هەموو کەس ئەیتوانی [شێخ‌مەحمود] ببینێ و ئەویش هەموو کەس ببینێ، هەرکەس کە ئەچووە لای سەربەخۆ وەزیرێک بوو، نەوەک هەر وەزیرێک بەڵکو «فەیلەسوف»ێک بوو بۆ ئیدارەی وڵات!.

جا پیاوێکی وەکو [شێخ مەحمود] لەناو شەپۆلی ئەم هەموو بیروباوەڕانەدا ئەبێ چۆن سەردەرکا و چۆن بکاتە ئەو ئامانجە کە ساڵەهای ساڵە بۆی ئەجەنگێ؟... تا لە باوەڕی دەستەیەک رزگاری ئەبوو، باوەڕی دەستەکەی‌تر سەری ڕێیان پێئەگرت.

[مێجە نۆئیل] گەلێ کۆششی کرد کە مەلیک لە باوەڕکانی‌تر بازگەشت بکاتەوە و بە تایبەتی نەکەوێتە شوێن فڕوفێڵی میکیافلی ئۆزدەمیر، هیچ کەڵکی نەبوو. بۆ ئەمەش کە بە تەواوی خۆی پیاو خراپ نەکا «چەکمەن»ی کرد بە وەکیلی خۆی لە سولەیمانی و خۆی سولەیمانی بەجێ هێشت.

کردەوە و باس و خواسەکانی «شێخ مەحمود» لەگەڵ ئۆزدەمیرا ـکە بە هۆی کۆششی پیاوە تورک خواکانەوە بوو ـ هەر زیادی ئەکرد، ئەم زیادکردنەش دەستی نەئەدا بۆ ئینگلیز. «چەکمەن» کەوتە خۆی و ئەویش دەستە و دایەرەیەکی پەیدا کرد و بەرە بەرە لەژێرەوە بۆ رووخاندنی حکومەتی [شێخ مەحمود] چاکیان لێکرد بە لادا. لە ئاخرا وای لێهات بە تەواوی دانیان لە یەک سپی بووەوە، مەکینەی حکومەتی کوردستانیش ئەوا جارێ هەر ئەگەڕێ.

[شێخ مەحمود] هەتا ئەهات شێرگیرتر ئەبوو، فیکری هاتە سەر ئەوە کە پەلاماری کەرکووک بدا. لەم رووەوە سەرۆکی عەشایەرەکانی بانگ کرد و کەوتە گفت و گۆ لەگەڵیانا. وەکو وترا لەبەرئەوە گەلێ شەپۆلی فیکری لە سولەیمانی‌دا هەبوو، هەندێک لەمانە لەگەڵی بوون و هەندێکیش قسەیەکی راستیان نەئەدا بە دەستەوە.

لەم دەورانەدا «سمایلاغای سمکۆ»یش هات بۆ سولەیمانی و بوو بە میوانی [حکومەتی کوردستان]، ئەو ماوەیە کە لە سولەیمانی مایەوە خزمەتێکی شاهانەکرا، لە رووی حوکمداری کوردستانیشەوە گەلێ قسە لە بەینی ئەو و «شێخ مەحمود»دا هات و چۆی کرد. هاتنەکەی ئەمیش وا رێ کەوتبوو کاتێک بوو کە حکومەتی کوردستان لەگەڵ ئینگلیزا شیریان لە یەک ئەسوو، سولەیمانی وەکو مەنجەڵی سەر ئاگر ئەکوڵا. بە تایبەتی چی ئینگلیز لە سولەیمانی هەبوو «شێخ مەحمود» دەری کردبوون.

ئینگلیزەکان زۆرداخ بەدڵ بوون لە[شێخ مەحمود]، ئەیانویست سولەیمانی لە دەست دەربهێنن و نەشیان ئەزانی چۆنی دەرێنن، هەرجارە لەشکریان ئەنارد و بە ناهۆمێدی لەشکری

ئەگەڕایە دواوە. ئەمجا هاتە سەرئەوە کە بە هۆی بۆمبابارانەوە سولەیمانی بە [شێخ مەحمود] چۆڵ بکا. ئەمەش لەسەرێکەوە ئیشێکی گران بوو بەرانبەر بە ئینگلیز؛ دوو شتی پێچەوانە لە سولەیمانی هەبوون؛ [شێخ مەحمود]ی لێ بوو کە داخی ناوە بە دڵی ئینگلیزەوە و لەبەرئەو بۆم بۆردمانی سولەیمانی ئەکا. [سمایل ئاغا]ی لێ بوو کە ئەو سەردەمە ئینگلیز سمایل ئاغای بە دۆست ئەزانی و نەیئەویست بە جارێ ئاگر لە هەموولایەکەوە بۆ خۆی بنێتەوە!.

هیچ چاری نەما، هات لە پێشا «بەیاننامە»ی فڕێدایە خوارەوە؛ لە ٢٣ شوباتی ١٩٢٣دا بۆ سمایل ئاغا کە سولەیمانی بەجێ بێڵێ چونکە ئەم ئەیەوێ بۆردمان بکا و نایەوێ ئەو تووشی زیان بێت. لە ٢٦ی عەینی مانگا بۆ [شێخ مەحمود] و ئەهلی شار، کە شار چۆڵ کەن بۆردمان ئەکات.

«سمایل ئاغا» لە ٢٨ شوباتی ١٩٢٣دا خۆی و سوارەکانی دیدەنیان تەواوبوو [رەشیدجەودەت]یان لەگەڵ چوو و چوونەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

پاش ئەوان [شێخ مەحمود]یش بە خۆی و لەشکریەوە چوونە دەرەوە و روویان کردە ئەشکەوتەکانی «جاسەنە». ئەهلی شاریش بەرەبەرە لەشار دەرچوون و روویان کردە قەرەداغ و شارباژێڕ و ئەو ناوە.

لە بەیانی ٤ی مارتی ١٩٢٣ دا هێشتا سولەیمانی بەتەواوی چۆڵی نەکردبوو، فڕۆکە بۆمبا هاوێژەکان بەسەر شاری سولەیمانی دا وەکو دالآش دەستیان کرد بە سووڕانەوە!. لە سووڕی یەکەم و دووەم و سێ‌هەم دا، یەکەم بۆمبایان خستە خوارەوە کە ماڵی [حاجی عارف بەگ]ی بەرکەوت، حەمەبەگی کوڕی نەبێ لەگەڵ براپچکۆلەکەیا لە بازاڕ بوون؛ کەسیان دەرنەچوون!. لەپاش هاوێشتنی چەند بۆمبایەک سولەیمانی بەجێ هێشت و گەڕایەوە. فڕۆکەکان نەگەیشتبوونەوە فڕۆکەخانەی خۆیان، لەشکری ئینگلیز گەیشت و سولەیمانی داگیر کردەوە.

کام سولەیمانی؟. ئەو سولەیمانیە کە بۆمبا کاولی کردەوە و دەنگی شین و شەپۆڕی گریان و زاری لەگەرووی کەسانەوە هەڵئەستێ کە فریانەکەتوون ناوشار بەجێ بێڵن!. بەمجۆرە پیاوەتیە ئینگلیز سولەیمانی گرتەوە وگۆیا حکومەتی [شێخ مەحمود]ی هەڵفڕان.

لەولاشەوە کە «شێخ مەحمود» رووی کردە وڵاتی قەمچۆغە و جاسەنە، فڕۆکە و باڵۆن هەموو ساتێک بەسەر سەریەوە بوو، بەڵام دڵقایمی و ئازایی شێخ مەحمود و پیاوانی [شێخ مەحمود] لەوەدا نەبوو کەسەر لەو جۆرەشتانە بکەنەوە. شەڕ لە بەینی حکومەتی کوردستان و ئینگلیزدا ببوو بە داشی دامە، هەر جارە بەلایە کائەسووڕایەوە.

لەو ماوەدا کە ئەو لە دەرەوەی سولەیمانی بوو، ئینگلیز جەورێکی زۆری ئەنواند لە سولەیمانی، هات و چۆی پیاوی «شێخ مەحمود» بە دزی هەموو هەر هەبوو بۆ سولەیمانی؛ ئەم جەورە هۆشێکی تری هێنایەوە بە بەر خەڵکا، لە لایەن [شێخ مەحمود]یشەوە سەرۆکی عەشرەتەکان بە تەواوی لێی کۆبوونەوە و هاتنە سەرئەوە کە بە پەلاماردانێکی مردن و ژیان،

پەلاماری ئینگلیز بدەنەوە و سولەیمانی لەدەست بسێننەوە.
خۆیان بۆ ئەم هێرشە ئامادە کرد و رووەو سولەیمانی هاتن، لە ١١ی تەموزی ١٩٢٣دا سولەیمانیان گرتەوە و ئینگلیزیان دەربەڕاندەوە، دیسانەوە «شێخ مەحمود» کەوتەوە قایمکردنی سولەیمانی و حوکمدارییەکەی جارانی. تا نزیکەی ساڵێک بەمجۆرە ئینگلیز هیچی لەگەڵ پێنەکرا.

* * *

لە ٢٥ی نیسانی ١٩٢٠دا کە بەریتانیا بەناوی ئینتیدابەوە نیشتەوە بەسەر عێراقەوە، هەرچەندە کە وەزارەتی دەرەوەی تورکیا لەو وەختەدا دانەیەک لە پەیمانەکەی «سیڤەر»ی وەرگرت و پاشان دایە دواوە و نەچووە ژێر ئەوقسانە کە لەبارەی سەربەخۆیی کوردەوە لەپەیمانەکەدا دابووی. قسەوباسی پەیمانی «لۆزان» لەپاش ئەو مێژووە لەناو حکومەتەکانا هەبوو، لە ئاخرا لە ٢٤ی تەموزی ١٩٢٣دا، ئەمیش ئیمزا کرا و بەتەواوی کوردیان لە هەمووشت بێ بەش کردا.
هێشتا پەیمانەکەی «لۆزان» ئیمزا نەکرابوو، واتە لە ساڵی ١٩٢٢ ـ ١٩٢٣دا کوردەکانی عێراق دەم و دوی ئەوەیان بۆ دەرکەوتبوو کە حکومەتێکی گەورەی وا کە کوردستانی عێراقیشی بەرکەوێ ـ لەبەرئەوە کە بەرهەڵستیان زۆرە ـ بۆیان دانامەزرێ و نایەڵن، بەڵکو ئەوجۆرە قسەیە لەناوا هەیە کە کوردستانی عێراق بخرێتە پاڵ حکومەتی عێراقی.
دوو حکومەتەی بەریتانیا و عێراق کەوتبوونە سەرئەوە کە پەیمانێک لەبارەی کوردەکانەوە بدەن و بە دڵخۆشی ئەم پەیمانە «شێخ مەحمود» لەو باوەڕەی خۆی هەڵگێڕنەوە. پەیمانەکەشیان ئەمەبوو:
«حکومەتی عێراق و بەریتانیا هەر دووکیان دان بە حقوقی ئەو کوردانە دا ئەنێن کەوان لە عێراقا و رێگەی ئەوەیان ئەدەن کە حکومەتێکی کوردی لە ناو ئەم چوار چێوەی عێراقەدا بۆ خۆیان دابنێن، لەم رووەوە خۆیان سەرپشکن بۆ درووسکردنی چۆنیەتی ئەو حکومەتە و بۆ دانانی سنووری. ئەشتوانن پیاویش بنێرن بۆ بەغدا بۆئەوە باسی پەیوەند و ئاشنایەتی ئابووری و سیاسی خۆیان لەگەڵ دوو حکومەتەی عێراق و بەریتانیادا ببڕێننەوە.».
ئەم قسەیەیان دا و کەسیشیان نەچوو بە گوێچکەیانا!.
لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا پەیمانی چوار ساڵەی عێراق ـ ئینگلیز هاتە پێشەوە، بەو مەرجە کە سەرەتای ئەم پەیمانە لە وەختێکەوە دەست پێبکا کە پەیمانی ئاشتی لە بەینی عێراق و تورکیادا بەسترێ. کە پرۆتۆکۆلی ئینگلیزی ـ عێراقی لە ٣٠ی نیسانی ١٩٢٣دا کرا و بە تەواوی دانی نا بەوەدا کە سەرەتای پەیمانەکە لەو مێژووەی پێشووەوە بێ، ئیتر ئەم پرۆتۆکۆلە بڕیاری دا کە سولەیمانی بکەوێتە پاڵ بەغدا، بۆ ئەوەش کە کوردەکان دڵیان هیچ چەکەرە نەکا، لە ١١ی تەموزی ١٩٢٣دا دیوانی وزاری عێراقی بڕیاری داکە:
[١ـ حکومەت بێجگە لە کار بەدەستانی پیشە و فەن؛ هیچ کار بەدەستێکی «عەرەب» لە وڵاتی کوردەواری دا دانەنێ.

٢ـ کوردەکان لە کاروبار و مراجەعاتی رەسمی‌دا حکومەت ناچاریان ناکا بەوە کە بە عەرەبی قسە بکەن.

٣ـ حکومەت پێوستە لە سەری پارێزگاری هەموو جۆرە حقوقێکی دانشیتوانی دینی و غەیرە دینی ئەو ولاتانە بکا.]

کەئەم قسانە هاتە ناوەوە، بەمانە تۆزێ ناوشاری سولەیمانیان هێمن کردەوە و پێنج نائیبیان چوو بۆ بەغدا.

***

لەملاوە ئەم فەرمانانە روویدا، لەولاشەوە ئەوەبوو کە «شێخ مەحمود» لە ١١ تەموزی ١٩٢٣دا سولەیمانی داگیر کردەوە و کەوتەوە ئیشکردنەکەی جارانی. لەم ماوەیەدا حوکمڕانی ئەکرد و کوردەکانی هەموولایەکی بە هەموو جۆر هات و چۆی سولەیمانی ـیان ئەکرد.

کە ئەم ئیشانە لە بەغدا روویدا، ئیتر دەستی نەئەدا بۆ ئینگلیز کە پیاوێکی وەکو «شێخ مەحمود» مەلیکی کوردستان بێت، یا دەستی نەئەدا بۆی کە کوردستان سەربەخۆیەکی ببێ، چونکە ئەو ئارەزووەی کە ئەو هەیبوو بە ولاتی کوردەواری عێراق، یا ئەو ئارەزووەی کە ئەو هەیبوو بە عێراق، پیاوەکانی بەغدا بە باری سوپاسەوە بۆیان جێبەجێ ئەکردا.

مەسەلەی کوردەکان و بەغدا بەرانبەر بە ئینگلیز وەکو مەسەلەی کابرای لێ هاتبوو کە کوڕە نەخۆشەکەی بردە سەر «سەی‌سایەق» و گیسکێکیشی لەگەڵ برد بۆی سەربڕێ، لەگەڵ ئەوەدا نەئەبوا گیسکی بیردایە، بەڵکو ئەبوا مەڕێکی بیردایە. کە چوونە سەر شەخسەکە رووی کردە شەخس و پێی وت:

«سەی‌سایەق! تۆ وەگیسکێ خاسی ئەکەیتەوە خاسی کەرەوە، خاسی ناکەیتەوە «بالاتەران» وەمامرێ کرە ئەکا!*».

لەم ماوەیەدا کە «شێخ مەحمود» لە سولەیمانی بوو لە هەموولایەکەوە بە تایبەتی لە قوڵی پێنجوێنەوە سەرۆکی عەشرەتەکان و هەموو جۆرە کوردێک هات و چۆیان ئەکرد و بە گیانێکی پاکەوە ئەیانویست ئەم حکومەتە بژیت. رسوماتی حکومەتیش وەکو جاران کۆ ئەکرایەوە و هەمووشتێک لە ڕێگەی خۆیەوە ئەڕۆیشت. لە ولاتی ئێرانا بە تەواوی دڵگەرمییەکیان بەم کوردایەتیە پەیدا کردبوو.

حکومەتی ئینگلیز و عێراق کەوتنە سەر ئەوە کە بە تەواوی قۆڵ بکەن بە قۆڵی یەکا بۆ لەناوبردنی حکومەتی «شێخ مەحمود»، وەزارەتی بەغدا وەزارەتی «جەعفەر عەسکەری» بوو، بەتەواوی لێ بڕا، با هەرجۆرە زیانێکیش روویدا، هێرش بەرنە سەر حکومەتی سولەیمانی. بە تایبەتی لە ٤ی مایسی ١٩٢٤دا کارەساتی کوشتاری بەینی «فەلە»کان و ئەهالی «کەرکوک»

---

* ـ «سەی‌سایەق» و «بالاتەران» دوو مەزارن لە شارەزوور، هەریەکە لەسەر کێوێکن بەرانبەر بەیەک.

روویدابوو، لێرەدا [شێخ مەحمود] زۆر بە سۆز هەڵیدایە و ئەیەویست لە تۆڵەی ئەو ئیشە ناشیرینەی «کەرکوک» دا تۆی فەلەکان بپڕێنێتەوە. لەملاوەش مەندوبی سامی بەغدا «سیر هنری دوبس» بە هەموو دڵێکیەوە ئەیەویست ئیشەکە بپۆشرێ، تەنانەت «فەتاح بەگ»ی موتەسەرفی کەرکوکی لابردبوو، «مەجید یەعقوبی» رەئیسی بەلەدیەی دانابوو لە شوێنی، هەر بۆ ئەوە بڕینەکە تەشەنە نەکا. کەچی لەولاوە [شێخ مەحمود] ریسەکەی ئەمی ئەکردەوە بە خوری و هەر زیاتر لەسەری ئەڕۆیشت.

کە «کەرکوک» تۆزی نیشتەوە ئەم ناسۆرە لە دڵی مەندوبی سامیا زیاتر ژانی پەیدا کرد، «میستەرکورنوالیس» موستەشاری داخلیە و شارەزای کاروباری وڵاتی سولەیمانی بوو، [مەندوبی سامی] ئاخر بڕیاری لەگەڵ داکە بەهۆی «عەلی جەودەت» وەزیری داخلیە و «جەعفەر عەسکەری» و دیوانی وزراوە تا ئاخر هەناسە بڕیار بدەن بۆ لەناوبردنی حکومەتی [شێخ مەحمود].

هەموو ئەم ئیشانە کرا و هێزی حکومەتی عێراقی بە هێزی عەسکەری لیوی و هێزی هەوایی بەریتانیەوە روو بە وڵاتی سولەیمانی کەوتە جمجوڵ. سەرەتای شەڕ هەر لە دەورروبەری [چەمچەماڵ و دەربەندی بازیان] دامەزرا، لەبەرئەوە دەستێکی نەهێنیش لەژێرەوە لە وڵاتی سولەیمانی ئیشی هەر ئەکرد، لەشکری [شێخ مەحمود] لەگەڵ ئەوەدا پیاوانی وەکو کەریم بەگی فەتاح بەگ و «سابیری کەریم بەگ»یشی هەبوو، هەر توانای گێڕانەوەی ئەو هێزانەیان نەبوو.

لە ئاخرا لە ١٩ی تەموزی ١٩٢٤دا شێخ مەحمود سولەیمانی بەجێ هێشت و عەسکەری عێراقی و ئینگلیزی سەرلەنوێ شاری سولەیمانیان گرتەوە و ئەمجارە بە هەموو توانایەکیانەوە کەوتنە قایمکردنی وڵاتی سولەیمانی و دەرەوەی، وردە وردە رەگی خۆیانیان تیا داکوتا، ئەمجا هەر بە قسەی ئینگلیز حکومەتی عێراق هێنای موڵکەکانی [شێخ مەحمود]ی هەموو زەوت کرد و بەیانی دەرکرد کە ئەم موڵکانە مافی «شێخ مەحمود»یان پێوەنیە.

[شێخ مەحمود] کە سولەیمانی بەجێ‌هێشت رووی کردەوە وڵاتی «جاسەنە» و لەملاوە تا وڵاتی پێنجوێن هەر بەناوی حوکمدارییەوە دەستی بۆ ئەبرد، کە هێزی حکومەت ئەچووە سەری لەشکرەکەی ئەچوونە ئەشکەوتەکانەوە و ئیتر ئەوان هیچیان پێ نەئەکرا.

هەروەها لە حوزەیرانی ١٩٢٥دا مەندوبی سامی بەغدا و حکومەتی عێراق فەرمانێکیان دەرکرد کە هەرکەس «شێخ مەحمود» بگرێ، چ بە زیندوویتی، چ بە مردوویتی شەست هەزار روپیەی بدرێتێ. بۆ «کەریم بەگی فتاح بەگ» و بۆ «سابیری کەریم بەگ»یش هەر یەکە ٢٠ هەزار روپیە بەخشش دانرا بۆ ئەوکەسە کە بانکوژێ یا بیانگرێ!.

کابرایەکی [فەلە]ی لیوی بەخۆگۆڕین چووبوو بۆ کوشتنی شێخ مەحمود و ئەوانیتر، شێخ پێی زانیبوو، لەپاش پرسیار لێکردن بە تەواوی بۆی دەرکەوت کە مەسەلە وایە، ناچار فەرمانیدا بە کوشتنی.

دەرچوونی [شێخ مەحمود] لە سولەیمانی و تێکچوونی حکومەتی کوردستان، لە دڵا کارێکی گەورەی ئەکردە سەر دڵی کوردەکان و لەبەر هێزی داگیرکەریش ئەوانەی ناوشار نەیانئەتوانی دەنگ بکەن. تەنانەت کوردە ناحەزەکانی [شێخ مەحمود]یش تێکچوونی ئەو حکومەتەیان هەر بەلاوە خۆش نەبوو، چاوەڕوانی ئەوەبوون کە ئەگەر هەڵێکیان بۆ هەڵکەوێ بەسەریا نەچن، جا سەر ئەکەون یا سەر ناکەون ئەمە شتێکی ترە.

ئینگلیز هەستی بەمە کردبوو ئەیەویست بە جۆرێکی [غیر مباشر] تا پێی بکرێ دڵی کوردەکان راگیر کا، بە تایبەتی ئەوا لەولاشەوە «شێخ مەحمود» کۆڵی نەداوە و هەر لە شاخەکانایە و زیاد لە قابلیەتی جارانی عەزیەتی حکومەت ئەدا، بوونی ئەو و مانی ئەو، هیوایەکی گەورەیە بۆ هەموو جۆرە کوردێک.

هەر لەبەرئەمە بوو کە لە شوباتی ١٩٢٥دا لەوکاتەدا کە لیژنەکەی «کۆمەڵی ئەقوام» هاتن بۆ تێگەیشتن لەو ناکۆکیەی بەینی کوردەواری عێراق و تورکیا لەسەر موسڵ، بەریتانیا ئەوەی زیندوو کردەوە کە ئەبێ کوردەواری عێراق پاڵ بدا بە عێراقەوە، بەڵام بەو مەرجە کە ئارەزووەکانی کورد بەجێ بهێنرێ؛ ئەو سێ ئارەزووانە کە لە ١١ی تەموزی ١٩٢٣دا دیوانی وەزارەتی عێراقی بڕیاری لەسەر دا و لە لاپەڕە ٨٣ ئەم کتێبە باسکرا.

دووپاتە کردنەوەی ئینگلیز بۆ ئەم قسانە هەر بۆ ئەوە بوو کە دڵی کوردەکان ـ وەکو باسکرا ـ گۆیا بکاتە خۆی!.

«شێخ مەحمود» لەگەڵ ئەوەشا کە لە دەرەوەی سولەیمانی بوو، لەملاوە بەتەواوی حکومەت و ئینگلیزەکانی بێزار کردبوو. حکومەت بە هیچ جۆر چاری نەئەکرد، لەولاشەوە لە خەتی پێنجوێنەوە لەگەڵ هەورامان و مەریوانا دەنگ و باسی قسەی داخستبوو کە روو بکاتە ئەو ناوەش، ماوەی بەینی جاسەنە و پێنجوێن و مەریوان دەسەڵاتێکی تەواوی بەسەرا هەبوو.

لەو سەردەمانەدا «میستەر ئەدمۆندس» بەقسەی «میستەرکورنوالیس» موستەشاری داخلیە لەو وڵاتانەدا ئەسووڕایەوە کە کەمتر دەستی «شێخ مەحمود»ی ئەگەیشتێ. یەکێ لەوشوێنانە «کۆیە» بوو. لەو وەختەدا «عەلی کەمال» لەوێ معاونی پۆلیسی کۆیە بوو. [میستەرئەدمۆندس] ئەچێتەلای پێی ئەڵێ کە گۆیا ئەو بەڵکو خۆی بگەیەنێتە «شێخ مەحمود» و پێی بڵێت دەست لە ئاژاوە هەڵگرێ و بچێت بۆ بەغدا. عەلی کەمال ئەمەی بەلاوە سەیر ئەبێ؛ [شێخ مەحمود]ێ کە خۆی بە مەلیکی کوردستان ئەزانێ چۆن لەشتێکی وادا ئەکەوێتە شوێن قسەی ئەم؟.

بە «ئەدمۆندس» ئەڵێ ئەمە ناکرێ، بەڵام من ئەتوانم لەگەڵ «سالح زەکی بەگ» دا ـ کە لەو وەختەدا لەگەڵ شێخ مەحمود بوو ـ قسە بکەم و بەڵکو ئەو شێخ تێبگەیەنێ.

لەسەر ئەم تەگبیرە «عەلی کەمال» قسەلە «سالح زەکی بەگ» ئەگێڕێتەوە و ژووان ئەدەن کە لەدێی «خەرابە» یەکتر ببینن.

ئەمجا هەر لەو ڕۆژانەدا هەر دوولا ئەچنە «خەرابە» و ئاخر قسەیان دێتە سەرئەوە کە بەڵکو

نواندوویە بەرانبەر بە کورد و بەشەعبی عێراقی تێ گەیاند. بە تایبەتی بەتەواوی گوێچکەی سەفارەتی بەریتانی زرنگاندەوە و داوای حکومەتێکی لامەرکەزی کرد بۆ کورد لەژێر سێبەری ئەم بزووتنەوەیەی [مەلامستەفا]دا.

ئەم بلاوکراوانە وگورج وگۆلی [حیزبی هیوا] لەملاوە و پێش کەوتنی یەک لەسەر یەکی هێزی [مەلا مستەفا] لەولاوە، بە جارێ حوکومەتی عێراقی و سەفارەتی بەریتانی بەغدای هێنایە سەر ئەوە کە گوێ قولاخ بوەستن و چاوی سەرسامی ببڕنە ئەم کارەساتە ناوختەبەرانبەر بەوان ـ ئینگلیز حوکومەتی عێراقی ـ.

راستە ناوەخت بوو چونکە جۆش و گەرمەی شەڕی گەورەی دووەم بوو، ئەڵەمان لەولاوە وەکو غەزەبی خوا رۆژ بە رۆژ لە پێش کەوتنا بوو. روس هاوپەیمانی ئینگلیزبوو، تورکیا لەوناوەدا بەبێ لایەنگری مابووەوە و نەیدابووە پاڵ کەس، ئەم مانەوەیە لەوناوەدا بەوجۆرە، ئینگلیز بەخێری خۆی نەئەزانی. لەوە ئەترسا ئەگەر تورکیا هەروا بمێنێتەوە رۆژی لەرۆژان دەوڵەتەکانی «میحوەر» و نازی، رووی لێ بنێن بە ناوی دۆستایەتی و دراوسێتیەوە کەرێگەیان بدا بە وڵاتەکەی ئەوا تێپەڕن بۆ پەلاماردان بەسەر هاوپەیمانەکانا. وەکو ئەمان ئەو رووەیان نا لە ئێران و ئێران سەرەتا رێی نەدان، پاشان بە «زۆر ئەزانێ قەواڵە لە کوێیە.» رێگەیان بۆ خۆیان پێ کردەوە و داگیریشیان کرد. [ئەڵەمان]یش ئەو چەشنە بکا لەگەڵ تورکیادا، سەرەتا رێگەی نەداو پاشان بەزۆر دایگرێ. ئەو وەختە ئەمانیش ـ واتە هاوپەیمانەکان ـ شتێکی وایان بەدەستەوەنیە کە بچن لەسەر تورکیا بکەنەوە و نەیەڵن «میحوەر» لەوێوە پەلاماریان بدا. هەروەها هاوپەیمانەکان ناشتوانن سوورا و سوور بەتورکیا بڵێن: تۆ وەرە لای ئێمەوە، یا ئیعلانی شەڕ بکە لەسەر «میحوەر». ناتوانن ئەمەی پێبڵێن چونکە ئەو وەڵامیان بەوە ئەداتەوە کە حوکومەتێکی سەربەخۆیە و قازانج و زیانی خۆی، خۆی ئەیزانێ و قازانجی لەوەدایە کەهەروا بەبێ لایەنگری بمێنێتەوە.

ئەم هەموو فیکرانە لەمێشکی ئینگلیزا دەوری ئەکردەوە و هەستانی [مەلامستەفا]ی دیارە لەم وەختەدا بەخێر و چاکەی خۆی ـ واتە ئینگلیزا ـ نەئەزانێ. بۆیەش نەیئەزانی ئەیوت نەوەک تورکیا بکەوێتە سەر ئەو باوەڕە بڵێت: «بەرزان» لەخاکی عێراقایە و عێراقیش وا لەژێر چنگی ئینگلیزا، کە مادام ئینگلیز لەم سەرسنوورەی منا ئەم شۆڕشە هەڵئەگیرسێنێ و شۆڕشێکی واش پێچەوانەی خێر و چاکەی منە، لە رقی ئەوا من ئەچم پاڵ ئەدەم بە «میحوەر»ەوە.

ئینگلیز کەوتبووە سەرئەوە کە شۆڕشی«مەلا مستەفا» بوەستێنێ، بەڵکو لەوەستانی ئەم شۆڕشەدا تورکیا ئاگادار ببێتەوە بەوە کە ئیعلانی شەڕ لەسەر «میحوەر» بکا. واتە بەڵکو ئەم پیاوەتیەی لەبەرچاو بێ کە لەبەر خێری ئەو شۆڕشێکی واکە ئەو هەموو زیانەی هەیە بۆ تورکیا وەستانی. خۆ ئەگەر لە ئاخرا «تورکیا» هەر سواری قسەی خۆی بوو، ئیعلانی شەڕی نەکرد لەسەر ئەڵەمانیا، ئەو وەختە ئەم دەست لەم وەستانی شەڕی «مەلا مستەفا» یە هەڵئەگرێ و ئەمجا

چی ئەکا بیکا!... هێنای لەبەرئەمانە نامەیەکی بۆ «مەلا مستەفا» نووسی و وتی:
«پێویستە کە شەڕ بوەستێنی و دەستی لێ هەڵگری و لەگەڵ حوکومەتی عێراقا رێ کەوی، ئەگەر خۆ هەر لەسەری بڕۆی مەعنای وایە ئەمە، تۆ شەڕ لەگەڵ بەریتانیا ئەکەی و ئەمەش پێچەوانەی خێر و چاکەی ئێمەیە.
حوکومەتی عێراقیش لە چەشنی ئەم نامەی ئینگلیزە، نامەی بەسەر هەموو دائیرەکانی ئەو دەورەدا بڵاوکردەوە کە«مەلا مستەفا» لە خۆڕایی بەیداخی ئەم یاخیگەریەی هەڵکردووە. ئەبێ شەڕ بوەستێنێ و بێت داوای لێخۆش بوون لە حوکومەت بکات.
کەمەلا ئەم نامە و بەیاننامانەی وەرگرت بەچاوەڕێی ئەوەکەبزانێ ئاخری کار چۆن ئەبێ، فەرمانیدا بە وەستانی شەڕ و بەئاگاداریکردنی ئەو شوێنانە کەتا ئەو وەختە کەوتبوونە ژێر چنگیانەوە.

* * *

وەزارەت، وەزارەتی «نوری‌سەعید» بوو، کەوت و پاشان بڕیار درا کە هەر ئەو دابنێتەوە، لە ١٩٤٣/١٢/٢٥دا سەرلەنوێ بۆجاری هەشتەم دایمەزراندەوە. چۆنیەتی وڵاتی کوردەواری و «مەلامستەفای بەرزان» وا بە پێویست ئەزانێ کە یەکێکی کوردی کوزی کوردی شارەزا بە وڵاتی [بەرزان] لەوەزارەتا بێت و بپلکێ بە ئیشی ئەوانەوە. لەم رووەوە گەلێ فیکر کرایەوە، لە ئاخرا باوەڕی نوری سەعید لەسەر«ماجید مستەفا» گیرسایەوە، بانگی کرد و هەمووشتێکی پێوت. ماجید وا دیار بوو شارەزای «ئەدەبیاتی فارسی» بوو بۆیە لەو وەختەدا ئەم شیعرە فارسیانەی ئەخوێندەوە:

آتش بجان افروختن * از بهر جانان سوختن
باید زمن آموختن * کار من است این کارها!.

بەلام «پاشا» بەڵێ راستەکە من لە ساڵی ١٩٣٠دا قائیمقامی ئامێدی بووم و بەهەمووجۆر شارەزای ئەو ناوچەیە هەم، ئەمەش راستە کەمن لەم دەوری دوایەدا [موتەسەڕیف] بووم لە وڵاتەکانی جنوب و پاشان بۆ پێنج ساڵ لەئیش وکار دوور خرامەوە، ئێستە چۆن ئەبێ من بچم بۆ شوێنێکی واو قسەبکەم و هیچ ناو و نیشانێکی حوکومەتی بەمنەوە نەبێ، تا من بە پشتیوانی ئەوەوە قسە بکەم. من وای بە باش ئەزانم کە بۆ ئەم ئیشە ئێوە وەزیرێکی تایبەتی دابنێن تائەو وەزیرە بەناوی حوکومەتەوە گفت بدا و هەمووکاروبارێک ببڕێنێتەوە. لام وایە ئەو وەزیرەش نابێ من بم، چونکە من لەبەرئەوە کەبۆ ماوەی پێنج ساڵ لە کار دەرهێنراوم ئیتر قانون ئەو رێگەمە ناداتێ کە تا ماوەکەم بەسەر نەچێ من بچمەوە ئیشی حوکومەت، ماوەش تازە پێنج شەش مانگی رۆیشتووە.
«پاشا» کە گوێی لەم قسە بەڕێ و جێیانە بوو وتی: ئەوە تۆ ئەڵێی چی و قانون ئەڵێ چی. قانون چیە من دان بەقانونا نانێم، وەرە یاالله وەزیر بە. ئەمجا بە ناوی «وەزیری بێلا وەزارە»وە و بۆ ئیشی

کوردەواری خرایە ناو لێستەی وەزیرەکانەوە.

ئینکار ناکرێ «ماجید مستەفا» پیاوێکی رووخۆشی وردبینی بازیکەری سیاسیە، ئەتوانێ لەسەر سێ چوار تەناف یاری بکا، لەوانەیە بە قسە و بەزەردەخەنە، ویستەی خۆی بە دۆست و دوژمنی بسەلمێنێ و تێی بگەیەنێ کە ئەو راست ئەکا. لێرەدا حوکومەت ئەوی هێناوە بۆ کاروباری کوردەکان، لەم وەختەدا واش چێنراوە بە گوێیشیا کە ئەمانە هەمووی یاری سیاسیە. لەولاشەوە «حیزبی هیوا» بەدەستەیەکی زۆر لە خوێندەوارانەوە پشتیوانی بزووتنەوەی «مەلا مستەفا»ن. ئەم خۆی نەچووەتە حیزبەکەوە، ناشیەوێ لەبەرچاوی ئەم حیزبە و کوردەکانەوە پیاو خراپ بێ. کەواتە وەکو کوردەکە ئەڵێ «دارێکی بەدەستەوەیە هەر دوو سەری ....»!... زیاتر کە تێکەڵاوی وەزارەتی «نوری سەعید» بووە ئەمە ئەوەندەی‌تر دوورنیە، دووری خاتەوە لەکوردەکان.

لەبەرئەمانە ئەمەی بەلاوە لە هەموو شت رێک‌وپێک‌تر بوو کە بێنێ بەهەر جۆربووە خۆی لە حیزبی هیوا نزیک خاتەوە بۆ ئەوە بە تەواوی بتوانێ ئامانجەکانی پێک بێنێ؟. بەڵێ خۆی نزیک خستەوە، بەڵام ئەم نزیک بوونەوەیە ئایا باوەڕی هەموو حیزبی هیوای راکێشا!. بڕوا ناکەم رایکێشابێ، بەڵکو [حیزبی هیوا] لەژێرەوە دوو باوەڕی بۆ پەیدا بوو؛ یەکێ لە لایەن هەندێکیانەوە ـ ئەوانەی کە شتی دووریان ئەخوێندەوە ـ بیروباوەڕیان ئەوەبوو کە تێکەڵاو بوونی «ماجید» لەم وەختەدا بە وەزارەتی نوری سەعید و نزیک بوونەوەی بەو جۆرە بێ پەردەییە لە کاروباری «بەرزان» و کورد و «حیزبی هیوا»، ئەیانوت ئەم کاسەیە بێ‌ژێر کاسە نییە.

باوەڕی دووەمیش لە لایەن هەندە کەسی‌ترەوە، ئەوەهەر رواڵەت پەرستی بوو هیچی‌تر؛ واتە لەبەرئەوە ماجید وەزیرە خۆشەویستە، نەوەک «ماجید» ئەگەر بەردێکیش وەزیربوایە هەر خۆشەویست ئەبوو!کە وا بوو ئەم دەستەیە بڕوایەکی نەئەکرایە سەر بیروباوەڕەکەیان، چونکە لە غەیری ئەو دەورەشا هەر وەزیرێکی کورد هاتووە ـ باهەر جۆربووبێت ـ هەر خۆشەویستی ئەو دەستەیە بووە.

«ماجید» لەپاش ئەوە کە نزیک بووەوە لە حیزبی هیوا و لە پاش ئەوەکە پێی وتن من لەبەر قازانجی کورد ئەم وەزارەتەم وەرگرتووە، داوای لە حوکومەت کرد کە سێ ئەفسەری کورد لە ئەفسەرەکانی عێراق بە ناوی «زابتی ئیرتیبات»ەوە بنێرێ بۆ وڵاتی [بەرزان]، حکومەتیش بڕیاری داخوازیەکەی‌دا. ئەمجا بە حیزبی وت ئێوە سێ ئەفسەر لە خۆتان هەڵبژێرن و بێت تا قسە بکەین. حیزبی هیوا ئەمەی زۆر پێخوش بوو. «ئەمین رەواندزی، عیزەت عەزیز و سەیدعەزیز سەیدعەبدوڵڵا»ی هەڵبژارد و ناردنیە لای ماجید. ماجید لە پاش قسە و گفت‌وگۆ لەگەڵیانا، هەرسێکیانی بە ناوی «زابتی ئیرتیبات»ەوە نارد بۆ مێرگەسوور کە چاویان بە «مەلا مستەفا» بکەوێ و قسەی لەگەڵ بکەن. لەملاشەوە حیزب دیسان خەبەری‌دا بە «مەلا مستەفا» کە ئەفسەرەکانی خۆمانن ـ واتە حیزبی هیوا ـ هاتوون بۆلات، بۆخچەی دڵت بەتەواوی بۆیان بکەوە.

کە ئەمانە ڕۆیشتن و پاش چاو پێکەوتنی «مەلا مستەفا» و قسەکردن لەگەڵیا، فیکری هەر دوولایان هاتە سەرئەوە کەداخوازیەکانی مەلا مستەفا ئەمانەی خوارەوە بێ. کە ئەمانە جێبەجێ کران ئەو وەختە ئەویش چەک فڕێ ئەدا:

(١ ـ درووستکردنی وڵاتێکی تایبەتی کوردستان کە ببێ بە پێنج لیواوە؛ کەرکووک، هەولێر، سولەیمانی، خانەقی، دهۆک.

٢ ـ دانانی وەزیرێکی کورد هەموو وەختێک لەوەزارەتا بۆ ئەوە کاروفەرمانی ئەم وڵاتانەی کورد ببینێ.

٣ ـ دانانی کوردێک بەمعاونی وەزیر لە هەموو وەزارەتەکانا.

٤ ـ زمانی کوردی ببێ بە زمانێکی ڕەسمی و لایەنی ئابووری و کشت و کاڵی وڵاتی کوردستانیش بە تەواوی ڕێک و پێک بکرێ. بەڵام لایەنی سەرباز و پۆلیس و دارایی ئەوە هەر وەکو خۆی بمێنێتەوە).

ئەم داخوازیانە لە لایەن هەموو سەرۆک عەشرەتەکانی تر و حیزبی هیواوە پەسەندکرا و دران بە حکومەتی عێراقی و بە ئینگلیز.

پاش گەیشتنی ئەم داخوازیانە بڕیار درا کە «ماجید مستەفا» بچێت بۆ «بەرزان» و ڕووبەڕوو لەگەڵ [مەلا مستەفا]دا قسە لەئیشی کورد بکەن و بە جۆرێکی جوان بیبڕێننەوە.

شەوی ١٩٤٤/١/٧ شەوێکی سەیر بوو لەبەغدا، لەسەر ئیستگەی شەمەنەفەری کەرکووک. [ماجید مستەفا] بۆ خزمەتی کوردایەتی ئەچوو بۆ [بەرزان]! هەچ کوردێک هەبوو لەبەغدادا بە هەموو قوتابی دانشکەدەکانەوە هاتبوون بۆ ئیستگە بۆ ڕەوانەکردنی «ماجید مستەفا» چونکە بۆ ئیشی کوردایەتی ئەچێ. ئەم کۆبوونەوە و ڕەوانەکردنەش بە قسەی «حیزبی هیوا» بوو.

ماجید ڕۆیشت و لەگەڵ مەلا مستەفا دا لە «مێرگەسوور» چاویان بەیەک کەوت و لەسەر ئەم شتانەی خوارەوە ڕێککەوتن و پاش حەفتەیەک گەڕایەوە بۆ بەغدا. شتەکانیش ئەمانە بوون:

(١ ـ گێڕانەوەی [شێخ ئەحمەد] و ئەوانەی لەگەڵیان بۆ بەرزان.

٢ ـ چوونی «مەلا مستەفا» بۆ بە غدا بۆ ئەوە بە دەستەوەدانی خۆی بنوێنێ.

٣ ـ کاروباری دایەرەکانی [بەرزان] ئەو کاربەدەستانە ببینن کە بە پیاوچاکی نا بانگیان دەرکردەوە.

٤ ـ کردنەوەی قوتابخانە و درووستکردنی جادە و چاوێریکردنی باری ئابوری و تەندروستی لە وڵاتی بەرزان.).

[ماجید] ئەمانەی کرد بە نووسراوێک و لیژنەیەکی هەر بۆ کاروباری بەرزان لە پێشترا حوکومەت دایـنابوو. نووسراوەکەی ماجید و لەسەر بڕیارەکەی لیژنە، دیوانی وزرا لە ١٩٤٤/١/٢٥دا باوەڕی هاتە سەر ئەم شتانە:

(١ ـ ئیدارەیەکی تازە لە قەزاکانی زێبار، ڕەواندز، ئامێدی، دەوروبەری [مێرگەسوور]،

شیروانی مەزن و بەرزان درووست بکرێ و کاربەدەستانی باشی بۆ دابنرێ، ئەگەر پێویستیش بوو بە ناوی «زابتی ئیرتیبات»ەوە ئەفسەریان بۆ بنێررێ.

٢ ـ درووستکردنی نوختەی پۆلیس لەهەموو ئەو ولاتانەدا، لەخەلیفان و ڕێزانەوە تا دیانە و کانی ڕەش.

٣ ـ کردنەوەی ڕێگە لەبەینی نوختەکانا.

٤ ـ دوورخستنەوەی «مەلا مستەفا» لە ولاتی «بەرزان».

٥ ـ گێڕانەوەی [شێخ ئەحمەد] و بەرزانیەکان بۆ بەرزان، هاتنی «مەلا مستەفا» بۆ بەغدا بۆ خۆبەدەستەوەدان. بەلام بڕیار لەسەر ئەم دووشتە: واتە ـ چوونی شێخ و هاتنی مەلا ـ ئەمە ئەکەوێتە دەست وەزارەتی داخلیە، یا [وەزیری بیلا وزارە]، هەر وەخت ویستیان بڕیاری لەسەر ئەدەن.

٦ ـ ئەوشتانە کەوا [مەلا مستەفا] و هاوڕێکانی لە حوکومەتیان داگیر کردووە لەگەل چەکەکانی خۆیانابیاندەنە دواوە بە حوکومەت.

٧ ـ حوکومەت ڕازی بێ بەوە کە موافقە بکا بۆ لێخۆشبوونی گشتی لەبەرزانیەکان بێجگە لە چەک هەلگرەکان و ئەوکاربەدەستانە کە لە حوکومەتا بوون و پاشان چوونەتە لای «مەلا مستەفا». ئەمە و کاتی لێخۆشبوونەکەشی ئەوە حکومەت خۆی ئەیزانێ، هەر وەخت ئارەزووی کرد ئەو وەختە بلاوی ئەکاتەوە.

٨ ـ هەر وزارەتێک چی لە ئەستۆ دایە جێبەجێی بکا).

لەم کاتەدا [ماجید] ڕووی کردە حوکومەت و حیزبی هیوا، کە ئەفسەرە ئیرتیباتەکان کەمن، ئەبێ زیادبکرێن و هەموویش ئەبێ لە «حیزبی هیوا» بن. بەلێ با زیاد بکرێن!. ئەمجا بە باوەڕی هەرسێ لا ـ واتە حوکومەت، ماجید، [حیزبی هیوا] ئەمانەی خوارەوە هەلبژێران و نێرران بۆ شوێنەکانی خۆیان:

١ ـ فوئاد عارف زابتی ئیرتیباتی پشدەر. ٢ ـ مەجید عەلی زابتی ئیرتیباتی ئامێدی. ٣ ـ سەیید عەزیزی سەیید عەبدوللا بۆ مێرگەسوور و برادۆست. ٤ ـ ئەمین ڕەواندزی بۆ ڕەواندز و بەرزان. ٥ ـ میرحاج ئەحمەد بۆ ئاکرێ. ٦ ـ مستەفا خوشناو بۆ بەرزان ٧ ـ عیزەت عەزیز بۆ بلە.

هەروا هەندێ شتیش وەکو ڕێگە و مێگە و شت بۆ دەستبڕین لە ولاتی «بەرزان» کرا!. پاشان شێخ ئەحمەدیش لە [حیلە]وە هێنرایەوە بۆ «بەغدا» و لە ١٩٤٤/٢/١٢ نێررایەوە بۆ [بەرزان].

لە ١٩٤٤/٢/٢٢دا «مەلا مستەفا» هات بۆ بەغدا بۆ ئەوە پیشانی حوکومەتی بدا کە خۆی داوە بەدەستەوە، لە ئوتێلی «شط‌العرب» دابەزیبوون.

ئەمانە بە چەکەوە بە ناو شارا ئەسوورانەوە، هەندێ لە ڕۆژنامە بەکرێگیراوەکانی ئەوسەردەمە کەوتنە تەقەکردن کە چۆن ئەبێ مەلا و پیاوەکانی بە چەکەوە بە سەر جادەکانا بسووڕێنەوە؟ ئاخر نازانن خەلکی زەنەقی ئەچێ!!. حوکومەتیش ئەم قسانەی چووبوو بە گوێچکەدا، لە پاش

خەفەتەیەک مەلا وای بە باش زانی کە بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆی و ئیترگەڕایەوە.

لەم ماوانەدا [ماجید] لەگەڵ هەموولایەک قسەی ئەکرد؛ لەگەڵ حوکومەت، حیزبی هیوا، مەلا مستەفا، سەرۆکی عەشایرە کوردەکان.

لەهەموویانی وا ئەگەیاند ـ بێجگە لە دەستەی حوکومەت ـ کە ئەم هات و چۆ و کۆششەی بۆ خزمەتی کوردە!. بەم ناوەوە و لەبەرئەمانە زۆر چاک لە کوردەکان نزیک کەوتبووەوە، بەڵکو ببوو بە هێلانەی بڕوای گەلێ کەس!.

تەنانەت بۆ ئەوە کوردایەتیەکە بەتەواوی سەربگرێ، لە مارتی ١٩٤٤دا لەگەڵ «نوری سەعید»ی سەرۆک وەزیر چوون بۆ کەرکوک، لەوێ زۆرێکی زۆر لە پیاوماقووڵ و سەرۆک عەشرەتەکانی کورد کۆ کرابونە و لە «یانەی کاربەدەستان»، نوری سەعید لەگەڵیان کەوتە قسەکردن و وەکو مامۆستایەکی دڵسۆز فێری ئەوەی ئەکردن کە چۆن کوردایەتی بکەن؟!. و چۆن داوای حقوقی کورد بکەن؟. و چۆن ئەگەر حوکومەت بە پوختی لەگەڵیان نەهاتە پێشەوە دەست بنێنە بیناقاقەی؟!... لە راستی دا ئەم کۆبوونەوەیە زۆر سەیربوو.!! هەر زۆر سەیر بوو!!.

ئەم کردەوانەی «ماجید» و ئەمجۆرە هات و چووکردنەی بۆ کوردایەتی بەتەواوی دڵی حیزبی هیوای کرد بە دوو کەرتەوە؛ کەرتێکی هەر لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە ئەم ئیشانەی بۆ کوردایەتیە، کەرتەکەی تری ئەیانوت مافی بە کوردایەتیەوە نییە و خزمەتی حوکومەت ئەکا. ئەمجۆرە دوو دڵیە بوو کە بوو بە بناغە بۆ تێکچوونی [حیزبی هیوا] و نەکەوتنەوە سەرخۆی، بۆیەش وای لێهات رۆژ بە رۆژ شتی تری ئەهاتە سەر.

* * *

لە جۆشی گەرم و گوڕی ئەم کوردایەتیەدا؛ واتە لە ٧ی نیسانی ١٩٤٤دا کوت و پڕ نوری سەعید وزارەتی دایە دواوە و کابینەکەی کەوت. ئەم کەوتنە ناوەختیە دڵی کوردەکانی لەزۆر لاوە کرمێ کرد، کە ئەو قسانەی پێشوو لە چی و ئەم کەوتنە ناوەختیە لەچی؟!.

لەگەڵ ئەوەشا هەر بە ناوی وەکالەتەوە مانەوە تا لە ٣ی حوزەیرانی ١٩٤٤دا «حەمدی پاچەچی» بۆجاری یەکەم وەزارەتی لەو وەرگرت و خستیە ژێر دەستی خۆیەوە، دیارە [ماجید]یش لەوەزارەت دەرچوو. ئیش وردە وردە سەرەولێژی رووی تێکرد.

مەسەلەش عیبارەت بوو لەمە کە شەڕی گەورەی دووەمی گێتی بۆنی ئەوەی لێ ئەهات‌کە لە دوایی هاتنە، بە تایبەتی ـ وەکو لە پێشەوە باسکرا ـ ئەو ئامانجەی کە ئینگلیز هەیبوو بەرانبەر بە تورکیا ئامانجەکەی پێک هات؛ پێک هاتنێکی وا، نەوەک هەر ئەوەندە کە تورکیا نەداتە پاڵ ئەڵەمانیا، بەڵکو دایە پاڵ ئینگلیز و ئیعلانی شەڕی لەسەر «میحوەر» کردا. ئیتر چ ئامانجێک لەمە خۆشترە بەرانبەر بە ئینگلیز؟!. کە مەسەلە وای لێهات ئیتر پێویست نیە کوردەکان کوردایەتی بکەن چونکە بۆ ئینگلیز بفەیە.

[نوری سەعید] و [ماجید مستەفا]ش وتوویانە بیکەن، کەواتە هیچ چارنیە غەیری ئەوەنەبێ

کە کابینە بکەوێت و کابینەی دوایی چی ئەکا ئەوە ئارەزووی خۆیەتی.

لە ڕاستی‌دا کە وەزارەتی [پاچەچی] هاتە پێشەوە وردە وردە تووندوتیژی دەستی پێکرد؛ حیزبی هیوا باوەڕیان بەوە هێنا کە کوردایەتیەکەی دەوری نوری سەعید و ماجید مستەفا گاڵتەیەکی سیاسی بوو، جا ماجید خۆی لەباوەڕی خۆیا هەر نیهادێکی بووبێ خەڵکە کەکەوتنە سەر ئەو مەفکورەیە کە هاتنی ئەو زیانی بە «حیزبی هیوا» گەیاند. زابتە ئیرتیباتەکان ئیش و کارەکانیان دوایی پێهێنرا و بەڵکو هەندێکیان هەر نەهێنرانەوە بۆ سوپا، تازە وەزارەت بڕیارەکانی وەزارەتی پێشوو بەرانبەر بە کورد و «بەرزان» بە پولێک نەکڕی، بەڵکو وەزارتی جەنگ خۆی کەوتە تەقە لەو ئەفسەرانە کە لە وەزارەتی پێشوا بە ناوی زابت ئیرتیباتەوە نێراون بۆ کوردەواری. بەکورتی کوردایەتیەکەی «نوری سەعید» و «ماجید مستەفا» وەکو سەرچۆپی جوولەکە بەرەو دوا ئەگەڕایەوە!!.

ئەفسەرەکان کەئیشی «بەرزان» و وڵاتی کوردەواریان دوایی هات هاتنەوە بۆ بەغدا. «میرحاج» و «مستەفا خۆشناو» کە سەیریان کرد کاروباری حیزبی هیواش تێکچووە لەم ڕووەشەوە دڵگرانیەکی زۆریان پەیداکرد، لەگەڵ «عیزەت عەزیز» هەریەکە دوو مانگ ئیجازەیان وەرگرت، «میرحاج» و «مستەفا خۆشناو» چوون بۆ وڵاتی موکریان بۆ چاو پێکەوتنی کۆمەڵەی «ژ.ک» ـ کەلەو دەورەدا لەو وڵاتە ناو و ناوبانگێکی پەیدا کردبوو ـ بۆ ئەوە هەر دوو کۆمەڵە کۆششی خۆیان بکەن بە یەک بۆ ئازاد کردنی کوردستانی گەورە. «عیزەت عەزیز»یش چوو بۆ سوریە، ئەویش بۆ ئەوە لەگەڵ کۆمەڵەی «خۆیبوون»دا یەک بگرن و تەقەلایان بکەن بەیەک. دیارە چوونی ئەمانە بۆ هەردوو شوێنەکە دوور نەبوو بە ڕاوتەگیری «حیزبی هیوا» بووبێت.

ڕۆیشتنی ئەمانە دڵی حکومەتی لە عاستیان کرمێ کرد، بە تایبەتی لە عاستی «میرحاج» و «مستەفا خۆشناو»، ئەمانیش تۆزێ لەباوەڕی حوکومەت بەرانبەر بە خۆیان تێگەیشتن. بڕیاریان‌دا کە «میرحاج» بگەڕێتەوە بۆ بەغدا و مستەفا لە بەرزان بێ بۆ ئەوە ئەگەر شتێکی خراپ ڕوویدا با هەر دووکیان تووش نەبن و «میرحاج»یش ڕۆژ بە ڕۆژ مستەفا لەدەنگ و باسی بەغدا ئاگادار بکا.

لەسەر ئەم پەیمانە لەیەک جیا بوونەوە، «میرحاج» کە هاتە بەغدا بۆنی هیچ شتێکی خراپەی بەرانبەر بە خۆیان نەکرد و بە پێچەوانەی ئەوە چووەوە سەرئیش وکاری ئەفسەریی و نامەشی بۆ مستەفا نووسی کەئەویش بێتەوە. مستەفا ـ ش هاتەوە تا نزیکەی مانگێک هەر دووکیان چوونەوە سەرئیش. کوت و پڕ هەردووک لە لەشکر دەرکران و میرحاج گیرا و نێررا بۆ «عەمارە»، مستەفا ـ ش بڕیار درا کە بگیرێ، بەڕێکەوت لەو وەختەدا لە موسڵ بوو، لە لایەن هەندێ لە دۆستانەوە ئەم خەبەرەی پێدرا. هەر لەوێوە خۆی گەیاندەوە «بێتواتە» و نەبوو بەداوەوە.

[عیزەت عەزیز]یش کە چووبوو بۆ سوریە و لەوێشەوە بۆ «میسر» و لە وەزارەتی جەنگ گەیەنرا کەبۆ چاو پێکەوتنی کوردەکانی ئەوێ و قسەکردن لەگەڵیانا چووە، دیارە فیکری گیرانی ئەویش کرا، بەڵام هەر کە گەیشتەوە بەغدا بەم حاڵەی زانی و لە پاش چاوپێکەوتنی هەندێ

کەس لەبەغەدا و کەرکووکدا، خۆی گەیاندەوە «بەرزان» و خەبەری بۆ «مستەفا خۆشناو» نارد کە ئەویش بچێت بۆ بەرزان. پاش مانەوەی ٤٥ رۆژ لە «بیتواتە» ئەویش خۆی گەیاندە «بەرزان».

* * *

دیارە لە تێکچوونی کاروبارەوە تا ئەم تەئریخە ماوەیەکی باشی خایان. هەندێ لە ئەفسەرەکان ئەوەبوو لە [بەرزان] کۆبوونەوە، «بەکر عەبدولکەریم» ـ کە ئەویش یەکێک بوو لە ئەفسەرە ئازادەکان و وەکو عیزەت و ئەوان پەڕاگەندە ببوو ـ لە بەرزان لەگەڵیان یەکی گرت. بە محەمەد مەحمودەوە ـ کە لە پاشا چوو ـ ئەوندە ئەفسەر لە «بەرزان» کۆبووەوە:

١ـ مستەفا خۆشناو ٢ـ عیزەت عەزیز ٣ـ عەبدولحەمید باقر ٤ـ محەمەد مەحمود ٥ـ شەوکەت نەعمان ٦ـ ئەحمەد ئیسماعیل ٧ـ بەکر عەبدولکەریم ٨ـ حیفزوڵلا ئیسماعیل.

ئەمانە بێجگە لە «محەمەد مەحمود» کۆمەڵێکیان لەژێر سەرۆکی «مەلا مستەفا»دا دانا و ناویان نا: «کۆمەڵی ئازادی». هێنایان بەیاننامەیەکیان نووسی کە عیبارەت بوو لە:

داخوازەکانی کورد و مەبەست لە شۆڕشی «بەرزان». ناردیان بۆ سەفارەتی ئینگلیز لە بەغدا و بۆ حکومەتی عێراقی و بۆ «حیزبی هیوا».

حیزبی هیوا کە ئەم بەیاننامەیەی پێگەیشت وەکو بڵێت لەخەو خەبەری بووەوە و لە ١٩٤٥/٢/١٠دا بڕیاریان دا کۆششی خۆیان سەر لە نوێ لەگەڵ «بەرزان» بکەنەوە بە یەک و مەبەستەکەیان خستە سەر کاغەز و بە «محەمەد مەحمود» دا ناردیان بۆ مەلا مستەفا. دەستەی بەرزان کە سەیری گورج و گۆڵی حیزبی هیوایان کرد، لە رۆژی ١٩٤٥/٢/١٢دا کۆبوونەوە و ئەم بڕیارانەیان دا:

١ ـ یەک بوونی هەموعەشایری کوردەواری.
٢ ـ رێک و پێککردنی هێزی چەکدار.
٣ ـ رزگارکردنی کوردستانی «عێراق» لە زوڵم و جەور، بەڵام لە رێگەیێکی سیاسی هێمنەوە.
٤ ـ داخوازە سیاسیەکانیان بگەیەنن بە سەفارەتەکان.
٥ ـ یەکگرتن لەگەڵ کۆمەڵە ئازادی خواهەکانی کورددا.
٦ ـ بەهۆی چاپەوە پڕوپاگاندە کردن بۆ خۆیان.
٧ ـ بەربەرەکانێ کردنی سیاسەتی ئیستعماری عێراق.

ئەمجا ماوەیەکی باش هەیئەتی بەرزان و [حیزبی هیوا] لەبەینی یەکا کەوتنە قاقەز نووسین و رێگە بەیەک پیشاندان و ئاگادارکردنی سەفیرە بێگانەکان لە حاڵ و ئەحواڵی کورد و لە چۆنیەتی مەبەستی «بەرزان». حکومەتیش لەملاوە بە هەر جۆر و بە هەر رێگەیەکەوە بوو، خەریکی کارقایمی خۆی بوو، بەڵکو ئاگاداری هەموو کوردەکانی دەستەی بەرزان و [حیزبی هیوا]ش بوو.

کوت و پڕ لەسەرەتای مانگی مارتی ١٩٤٥دا خەبەرێک لە حیزبی هیواوە بە بەرزان گەیشت کە فەوجی ٤ی عێراق کە لە «بافستیان»، رۆژی پێنجی مانگ فیکری پەلاماردانی هەیە،

ئاگادارین.

که ئەم خەبەرە وەرگیرا، ئەمانیش قایمکاری خۆیانیان کـرد و بـەمجۆرەی خـوارەوە خـەتی شەڕیان دامەزراند:

خەتی بەشی رۆژهەڵات: (شێتنە، مێرگەسوور، ناوچەی برادۆست» لەژێر فـەرماندەیی «مستەفا خۆشناو» و «محەمەد مەحمود» دا.

خەتی بەشی رۆژئاوا: «ئامێدی و ناوچەی ڕێکانی» لەژێر فـەرماندەیی «عـیزەت عـەزیز» و «عبەدولحەمید باقر»دا.

خـەتی جـنوب: نـاوچەی «ئـاکـرێ» لەژێـر فـەرماندەیی «شـێخ سـلەیمانی»ی «شێخ عەبدولسەلام»دا.

ئەمانە هەموو شوێنەکانی خۆیانیان گرت و بە هەموو جۆر خۆیان ئامادە کرد بۆ گێڕانەوەی ئەو هێرشانە کە بەسەریانا ئەگەر بکرێ. لەگـەڵ ئـەمەشا فـەرماندەی گشـتی ـ مسـتەفا بـەرزانـی ـ دەستوراتی پێدابون کە تا ئەتوانن بەهێمنی بیزوونەوە و ڕێگەی ئاشتی بگرن. لە ٤ی مانگدا ئەم نامەیەشی بۆ سەرۆکی هەموو سوپای ئەو ناوەی عێراق ـ رفیق عارف نوسی:

«... وەکو بۆمان دەرکەوتووە فیکرتان وایە رۆژی ٥ی مارت بەناوی مـەشق و مـناوەرەوە لە شوێنی خۆتان پێشکەون. لە ڕووی ئەم فەرمانەی ئێوەوە ئەگەر هـەرزیانێک ڕووی دا ئـۆباڵ لە ئەستۆی ئێمەدا نییە.».

لە رۆژی دواییدا وەڵامی سەرلەشکر هاتەوە کە ئەمانە هیچ ئەو نیازەیان نیە پێشکەون. دیار بوو پێش دەست پێکردنی دەستەی [بەرزان]، سەرۆکی لەشکری عێراقی هێنابووە سـەر ئـەو قسەیە کە گۆیا ئەوان فیکری هیچیان نیە.

رۆژی ٧ی مـانگ [مـحەمەد مـەحمود] بـە فـەرمانی سـەرۆکـی گشـتی نـێررا بـۆ نـاوچەی «برادۆست» و «باڵەک» بۆ کاروباری هەندێ فەرمانی ئەو ناوە. کەچوو هاتەوە ئەو ڕێگەیەی بۆ فەرماندە داناکە خۆی بچێت و لەو ناوەدا گەشتێک بکا و ئەگەرناکۆکیەک لەبەینی عەشایرەکانا هەبێ، لای بەرێ و دیدەنیەکیشیان بۆ تازە کردنەوەی پەیمان لەگەڵ بکا. فەرماندە قـسەکـانی بیست و پاش ئەوە کەوتە گەڕان. رۆژی ٢٣ی مانگ فەرماندە چوو بۆ خەتی رۆژهەڵاتی لەشکری خۆی، رۆژی ٢٤ لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی خۆیانا چوون بۆ «هەودیان».

بزووتنەوە و قایمکاری [بەرزان] بەتەواوی بڵاو ببووەوە، حوکومەتی عێراق و ئینگلیز ئاگایان لەهـەموو کـەین و بـەینێک پـەیدا کـردبوو. بـەتایبەتی ئـینگلیز کـەئیشی لەهـەموولایەکـەوە بـۆ ڕێککەوتبوو، لەمانەوەی ئەم کارەساتی بەرزانە بەمجۆرە وەکو مووی لووتی هەڵکێشن وابووا. لە بەرئەمە خەبەر درا کە رۆژی ٢٥ی مانگ «کاپتان ستۆکس» مشاوری سیاسی ئـینگلیز دێت بـۆ «هەودیان» بۆ چاوپێکەوتنی [مەلا مستەفا]. فەرماندە لەوێندا مایەوەو ستۆکس ـیش هات. ئەمجا قسەئەمەبوو کە، ستۆکس وتی:

«لەبەرئەوە نەیروی عێراق نەشارەزای هەندێ کاورباری شەڕن، نەیروی ئینگلیز بڕیاری داوە لەنزیکی ئەم وڵاتی بەرزانەوە، عێراقیەکان فێری ئەو جۆرە شەڕەبکات و ئەمەش غەیری مەشق کردن و مناوەرە نەبێ، هیچی تری تێدا نیە، نابێ ئێوە بکەونە پەرۆشەوەبۆی، کەوابوو پێویستە فەرمانەکانی حوکومەتی عێراق وەربگرن و ئەو ئەفسەرە کوردانەکە لەلای ئێوەن و ئێستە لەخەتی شەڕدان بچنەوە بۆ [بەرزان] و شەڕ و شۆڕ بەجێ بێڵن، هەر شوێنێ کە خۆیان ئارەزوو ئەکەن لەعێراقا تیایا دانیشن و پاشان لەگەڵ ئەو ئەفسەرانەداکەهەر هێشتا لە بەرزانن، هەموو بچنەوەلای حوکومەت و بچنەوە سەرئیشی خۆیان لەنەیروی عێراقا».

ئەم قسە لووسانە وا دیاربوو فەرماندەی لە خشتە نەبرد! بەڵکو پێی وت: «ئێمە دوو شتمان لە پێشە! یا مردن، یا ئازادی کورد. چونکە بۆمان دەرکەوتووە کە حوکومەت وەنەبێ نیهادێکی باشی لەگەڵ ئێمەدا هەبێ، تا ئێستە هەزار قسەی کرد و هیچی بە ئەنجام نەگەیاند. چوونەوەی ئەفسەرەکانیش ئەوە کەوتۆتە دەست وەزارەتی جەنگ، ئەگەر بە سانایی لەگەڵیان بزونتەوە ئەچنەوە، بۆچ ناچنەوە؟.» پاش ئەم قسانە ستۆکس گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی.

رۆژی ٣٠ مانگ موتەسەڕیفی هەولێر ـ سەعیدقەزاز ـ لەگەڵ مودیری پۆلیس چوون بۆ «مەزنە» هەر بۆ چاوپێکەوتنی فەرماندە، لەبەرئەوە کە لە وەڵامەکەی ستۆکس زیاتریان وەرنەگرتەوە، گەڕانەوە بۆ هەولێر و فەرماندە و ئەفسەرەکانیش چوونەوە بۆ «شێتنە».

رۆژی ٣١ی مانگ نامەیەک لەلایەن رەئیس عەشیرەتەکانی «بالەک»ەوە گەیشتە دەست فەرماندە کە ئەیانەوێ بێن بۆ دیدەنی و بۆ پەیمانی زیادە ئاشنایی. فەرماندە گوندی «شێتنە»ی بۆ دانان. هاتن و چاویان بەیەک کەوت و گەڕانەوە. لە رۆژی ٢ی نیسانی ١٩٤٥دا نامەیەک لە لایەن ئامر فەوجی رەواندزەوە درایە دەست فەرماندەی لەشکری [بەرزان] کە «رۆژی ٥ی مانگ «مێجەر موور» ـ مشاوری سیاسی «موسڵ» ئەیەوێ بێت بۆلاتان و لە [بلە] چاوی پێتان بکەوێ. بەو بۆنەوە ئەگەر رێک ئەکەوێ ئێوە و [شێخ ئەحمد] و هەموو ئەفسەرەکان بچنە [بلە] بۆ ئەم چاوپێکەوتنە». رۆژی پێنج ئەمان هەموو لە [بلە] کۆبوونەوە، بەڵام «موور» نەهات.

دیسان رۆژی ٢٠ی نیسان خەبەرێک لەلایەن موتەسەڕیفی هەولێرەوە درا بە [مەلامستەفا]ی فەرماندار کە «مێجەرموور» ئەیەوێ لە [حەریر] ـ عیزەت عەبدولعەزیز ـ ی چاوپێبکەوێ. فەرماندار دەستووریدا بە عیزەت کە لەگەڵ [محەمەد مەحمود]بچن بۆ ئەو چاوپێکەوتنە. تا ئەمان چوون، گۆیا [موور] چووبوو گەڕابووەوە، ئیتر یەکتریان نەبینی.

رۆژی ٢٢ی نیسان دیسان لە لایەن مودیری ناحیەی «باتاس»ەوە خەبەر درایەوە بەفەرماندار کە «ئیسماعیل نامیق» وەزیری جەنگ ئەیەوێ عیزەت عەبدولعەزیز لە «پیرمەم» چاوپێبکەوێ. فەرماندار فەرمانی دایەوە بە [عیزەت عەزیز]کە لەگەڵ [محەمەد مەحمود] بچن بۆ پیرمەم و ئەم چاوپێکەوتنە بکەن. تا ئەمان چوون [ئیسماعیل نامیق] گەڕابووەوە بۆ بەغدا، [سالح صائیب] سەرۆکی هەموو لەشکری عێراق لەوێ بوو، ئەو لەباتی وەزیری جەنگ تا چوار سەعاتێک بەبێ

ئەگەر پێویست بوو، لە باڵوێزی بەریتانی «مێجەر موور» ببینن.

ئیتر لەوێوە بەڕێکەوتن بۆ بە بەغدا و پاش دوو ڕۆژ چوون بۆ وەزارەتی جەنگ خۆیان دا بەدەستەوە، بەڵام زۆری پێ نەچوو، واتە لە پاش ٢٠ ڕۆژ وەزارەتی جەنگ دانی بە بەمەحکەمەی عەسکەری، گۆیا ئەم دانەیان بەمەحکەمە شتێکی ڕووالەتیە، ئەگینە وەنەبێ شتێکی تێدابێ!. ئەم کردەوەیە دڵی هەندێکیانی کرمێ کرد، لەبەرئەمە «محەمەد مەحمود» لە ڕۆژی ١٩٤٥/٦/٥ دا هەڵات و «جەلال ئەمین مەحمود» ـ کە ئەویش ئەفسەرێکی‌تر بوو لەنەیروی عێراقا و دۆستی محەمەد بوو ـ ئەویشی لەگەڵ خۆی برد و پێکەوە بەرزان بگرە و هاتم.

ڕۆژی ١٧ی حوزەیرانی ١٩٤٥ موتەسەرڕیفی هەولێر «سەعید قەزاز» خەبەری نارد بۆ مەلامستەفا کە لەگەڵ «کاپتان چاکسن» معاونی مشاوری سیاسی کەرکووک ئەیانەوێ لە «مێرگەسوور» چاویان پێی بکەوێ و پێکەوە هەندێ قسەبکەن. لەبەرئەمە لەڕۆژی ٢٠دا هەموو لە مێرگەسوور کۆبوونەوە و کەوتنە قسەکردن. قسەکانی سەعید قەزاز و مەلامستەفا زۆر لەیەک دووربوون. «سەعید قەزاز» بە ناوی کاربەدەستێکی بە هێزی حوکومەتەوە لێی ئەخوڕی، مەلا مستەفا ـ ش بە خۆی ئەوت تا ئێستە سەری بۆ کەس دانەنەواندوە، ئێستە چۆن ئەم قسە تیژانەی «سەعید قەزاز» هەڵبگرێ؟! دیارە هەڵیناگرێ، لەبەرئەمە بەینیان تێکچوو، بەڵکو ئەگەر «چاکسن» نەبوایە ئیش زۆر خراپ تێکئەچوو. ئیتر بەو بۆنەوە بە ساردی لەیەک جیابوونەوە.

* * *

کاروبار ڕۆژبەڕۆژ بەلای خراپیەوە ئەڕۆیشت، حوکومەت گوێچکەی لەعاستی عەدالەت و حەقپەرستی ئاخنیبوو، پیاوانی حوکومەت غەیری ڕۆژانی ڕەش نەبێ هیچی‌تریان پیشان نەئەدا. [بەرزان] لەلایەکەوە بەدەست برسێتیەوە چەوسابیووەوە، لەلایەکەوە بەدەست توند و تیژکاری کاربەدەستە نارەواکانەوە هاتبووە تەنگ، دادوعەدل وادیاربوو تۆزێکی مناڵان بوو بەدەست هێزەوە بەهەمولایەکا هەڵێنەسووڕان! [بەرزان] لەم ڕۆژەدا کە هەر چوار دەوری بە لەشکری زوڵم گیراوە و بەزنجیری بێ ویژدانی ولاتەکەیان بەستۆتەوە ئەبێ چبکا؟. چاری نیە ئەبێ کۆشش بکا بۆ لابردنی ئەو زوڵمە و بۆ پساندنی ئەو زنجیرە.

لێرەدا فەرماندارێ گشتی ـ مستەفا بەرزانی ـ لە ڕۆژی ١٩٤٥/٦/٢٥ سەرانی لەشکر و «محەمەد مەحمود» و «جەلال ئەمینی» دانا وکەوتنە قسەکردن. ئاخر قسەیان هاتە سەر ئەوەکە بە ولاتەکانی دهۆک ـ ئامێدی ـ ئاکرێ ـ شێخان و سنجار ـ! لەملاوە؛ لەولاشەوە بە ڕەواندز ـ کۆیە ـ دزەیی ـ ڕانیە ـ هەڵەبجە و خانەقی داگەشتێک بکەن و هەموو سەرۆک عەشایرەکانیان چاوپێبکەوێ و قسەیان لەگەڵ بکەن بۆ دەست دانە شۆڕشێکی قەومی کوردەوە. ئەمجا لەڕۆژی ٢٧ی ئەو مانگەدا کەوتنە گەڕان بۆ بە ئەنجام گەیاندنی مەبەستەکەیان. ئەم گەڕانەیان تا نزیکەی ئاخری مانگی ئاغستوزی ١٩٤٥ درێژەی کێشا و هەموو سەرۆک عەشرەتەکان بەگیان و بەدڵ قسەیان دایە و دڵنیایان کرد.

دەنگ لەگەڵ [عیزت عەزیز] قسەیان کرد، بەمەرجێک کە هەر دوو، هەر دوو بەدوو بوون!. تەنانەت [محەمەد مەحمود]یشیان لەگەڵ نەبوو. ئێستەش نەزانرا قسە و باسی دانیشتنی ئەو دوو کەسە چی بووا؟. ئەوەندە هەبوو، عیزەت کە لەلای سالح صائیب دەرچوو، وتی کاروبارێکی باش هاتۆتە پێشەوە، ئێمە ئەتوانین بەبێ ترس بچین بۆ هەولێر و لەگەڵ [حیزبی هیوا]دا هەندێ قسە و باس بکەین. هەر لەوکاتەدا لەگەڵ [محەمەد مەحمود] ڕووبەڕووی هەولێر بوونەوە و ئەم باسی گەڕانەوەی خۆیانە ـ واتە ئەفسەران ـ بۆ نەیروی عێراق خستە بەردەستی حیزب. هیوا ـ ش ئاخر قسە هاتە سەر ئەوە کە ئەوان خۆیان سەربەستن بە گەڕانەوە یان نەگەڕانەوە.

هەر لەو سەروبەرەدا [مێجەر ولّسن] معاونی مشاوری سیاسی کەرکووک ـ یش هاتبووە هەولێر فیکری «حەریر»ی هەبوو، عیزەت و محەمەد ـ یش ئیشی خۆیان لە حیزبی هیوای هەولێر جێبەجێ کردبوو، ئەوانیش ئەیانویست بگەڕێنەوە، لەگەڵ [ولّسن] هەرسێکیان لە ئوتومبێلێکدا چوون بۆ «حەریر». کە چوونە ئەوێ، زۆری پێ نەچوو [مێجەر موور]یش گەیشتە حەریر. [عیزەت عەزیز] توانی چاوپێکەوتنێکی دوو بەدوویش لەگەڵ [موور] پێک بێنێت!.

ڕۆژی ٢٥ی نیسان [موور، عیزەت عەزیز و محەمەد مەحمود] چوون بۆ بەرزان، [موور] ئەیویست [شێخ ئەحمەد]ی چاوپێکەوێ، چونکە چوونەکەی بۆ ئەوەبوو کە چوون، ئەو چووە لای شێخ ئەحمەد، پێی وت: «سەفیری بەریتانیا ئەڵێ ئەبێ فەرمانی حوکومەتی عێراق بەجێ بێنن و چەکەکانتان بدەنە دواوە و بە کشت و کاڵەوە خەریک بن.!».

[شێخ ئەحمەد] بەم قسەیە زۆر تێکچوو، وتی: «هەروەخت لە ئاسووریەکانی دراوسێمان و عەشایرەکانی تر چەک وەرگیرایەوە، ئێمەش ئامادەین بۆ دانە دواوەی.» ئەم قسەیەی کرد و لە کۆڕە کە هەستاو موور ـ یش بە شوێنی خۆیا گەڕایەوە بۆ دواوە.

ڕۆژی ٣٠ی نیسان «کۆمەڵی ئازادی» کۆڕێکیان بەست لە بەرزان بۆ قسەکردن لەوەکە ئایا ئەم ئەفسەرانە بگەڕێنەوە نەیروی عێراق یان نە؟. میرحاج ـ یش کەوەختی خۆی ئەوەبوو گیرابوو نێررابووە [عەمارە]، هەڵاتبوو. ئەویش لە ئەندامی کۆڕەکە بوو. پاشان قسەهاتە سەرئەوە کە ، عیزەت عەبدولعەزیز محەمەد مەحمود و ئەحمەد ئیسماعیل بگەڕێنەوە سەرئیشی خۆیان لە سوپای عێراق، مستەفا خۆشناو و میرحاج ـ یش [بەرزان] بەجێ بێڵن و بچن لە شوێنێکی تر دانیشن. ئەم هەیئەتی ئازادیەش بۆیە ئەم بڕیارەیان دا فیکری دوا ڕۆژێکی تریان کردەوە. بەڵام دوا ڕۆژ دەری خست کە ئەو دواڕۆژە هیچ کەڵکێکی نەبوو!. تەنها [مستەفا خۆشناو] و [میرحاج] بە پوختی تێگەیشتبوون کە ئەو دواڕۆژە لەباتی ڕووناک بێ تاریک ئەبێ!.

ئەمجا هەر ئەو ڕۆژە مستەفا و میرحاج بەرزانیان بەجێهێشت، ڕۆژی دوایی، واتە ڕۆژی ١٩٤٥/٥/٢ فەرماندەی گشتی ـ مەلا مستەفا ـ عیزەت عەزیز، محەمەد مەحمود، ئەحمەد ئیسماعیل ـ ی هەڵگرت و بە ئوتومبێلی «مێجەر ولّسن» هاتن بۆ [هەولێر]. ڕۆژی ٥/٥ هەرسێ ئەفسەر چوونە کەرکووک و چاویان بە «ولّسن» کەوت، پێی وتن کە ئەبێ بچن بۆ بەغدا، لەوێ

کوت و پڕ هەر لەو ڕۆژەدا لە کاتێکا کە مەلامستەفا لەدێی «مرەبا» بوو ـ کە چوار ڕۆژە ڕێگە لەبەرزانەوە دوورە ـ کاغەزێکی لەلایەن موتەسەڕیفی هەولێر ـ سەعید قەزاز ـ ەوە بۆ نووسرابوو، بۆ «بەرزان»، تیایا نووسیبوو:

«پێویستە لەئێستەوە تا سێ ڕۆژی‌تر خۆت و هەموو سەرۆک عەشرەتەکانی [بەرزان] خۆیان بدەن بەدەستەوە ـ واتە بەدەست حوکومەتەوە ـ ئەگەر وا نەکەن ئۆباڵی هەموو کوشتن و زیانێک ـ کە لەم بەگوێ نەکردنەدا ڕوو بدا ـ ئەچێتە ئەستۆی تۆ!».

هەر لەعەینی ڕۆژا کاغەزێکی «کۆلۆنیل مید» مشاوری سیاسی موسڵ گەیشت، ئەویش ئەڵێ: «ئەگەر بەگوێی حوکومەتی عێراق نەکەیت، لەهەموو چاوێریەکی ئێمە بێبەش ئەبیت!».

هەر لە ئەم ڕۆژەدا [مەلامستەفا] کاغەزێکی «شێخ ئەحمەد»ی براشی وەرگرت کە نووسیبووی:

«شۆڕش لەبەینی هێزی [بەرزان] و حوکومەتا دەستی پێکرد، بەرزانیەکان گەلێ لەنوختەکانی پۆلیسی حوکومەتیان لەبەرزان گرت، [مێرگەسوور] گیرا، «ئاڵۆبەگ»ی خاڵ ـ مان کوژرا، کەواتە هەر زووبگەڕێوە!».

کارەساتی [ئاڵۆ بەگ]یش ئەوەبووە کە لەگەڵ دوو سێ پیاوی خۆیا ئەچن بۆ نوختەی «مێرگەسوور»، ئەمانەش تفەنگیان پێ ئەبێ، پۆلیس پێیان ئەڵێ تفەنگەکانتان دانێن ـ ئەمجۆرە قسانەش فەرمانێک بووە کە موتەسەڕیفی هەولێر کردوویەتە سەر هەموو نوختەکان، وتوویە ئەگەر بەرزانیەکان هاتن، چەکیان لێ وەربگرنەوە و ئیش و کاری دائیرەی حوکومەتیشیان بۆ مەڕوێنن!.

ئەم چەک فڕێدانە بەرانبەر بەعەشرەت شتێکی سووکە. هەرچەند بەخۆشی قسەئەکەن کەڵک ناگرێ، لە ئاخرا لەگەڵ پۆلیسەکان ئەبێ بەشەڕیان، «ئاڵۆبەگ» و پیاوێکی ئەکوژرێن، لەولاش چەند پۆلیسێک ئەکوژرێ و نوختە چۆڵ ئەکەن.

ئەم کارەساتی یەک لەدوای یەکانە کە [مەلامستەفا] لەماوەیەکی کەما هەمووی بیست، خستیە عالەمێکی‌ترەوە!. بە تایبەتی ئەو لەوباوەڕەدا نەبووە کە ئەگەر ئەو لە «بەرزان» نەبێ ئاگری شەڕ بەو جۆرە هەڵگیرسێ. فیکری هاتەسەر ئەوە کە ئەمە دوور نییە ئەم دوورکەوتنەوەی ئەوە لە بەرزان بووبێ بەهەل بۆ ئەوکەسانە کە ئەیانەوێ بەهەر جۆربووە شەڕ هەڵگیرسێ!. لەگەڵ ئەمانەشا و لەگەڵ ئەوەشا کەهێشتا نەخشەی گەڕانەکەی ـ کە دایێنابوو ـ بەتەواوی پێکی نەهێنابوو، ناچار بوو بە پەلە لە ڕۆژی ١٩ی ئاغستۆزی ١٩٤٥دا خۆی گەیاندەوە «بەرزان».

* * *

لێرەدا بۆ ئەوە خوێنەر بەتەواوی لەهەموو کارەساتەکە تێبگا، پێویستە تۆزێ فیکری خۆی بەزانینی ئەم شتانەی خوارەوە ڕوونتر بکاتەوە:

«بەرزان» ئەم بزووتنەوەیەی کە کردی نەوەک بزووتنەوەیەک بوو تەنها بۆ خۆی بەڵکو ئیشێکی

وای کرد، بوو بەهۆی بزووتنەوەیەکی قەومی لەناو هەموو کورددا، لەبەرئەوە کە رۆژ بە رۆژ ئەو بزووتنەوەی قەومیە بە هێزتر ئەبوو، دیواخانە سیاسییەکانی حوکومەتی عێراقی زۆر خراپ شڵەژاندبوو؛ بە جۆرێک شڵەژابوون لایان وابوو وەکو ئاگر ئەمە رۆژ بە رۆژ زیاتر ئەتەنێتەوە، کەواتە بەهەر جۆر و بەهەر کوشتن و بڕینێک بێ ئەم ئاگری بزووتنەوەیە ئەبێ ئاوی پیابکرێ و بکوژێنرێتەوە!. لەگەڵ ئەم کۆششەی ئەملاشدا «بەرزان» بە هەموو هێزێکیەوە ئەیویست خۆی لەشەڕ بپارێزێ و بە هێمنی و لەسەرخۆیی ئیشی خۆی بکا. دیارە ئەم باوەڕە باوەڕی مەلامستەفا بوو، هەتا ئەو لەناو بەرزانا بوایە بڕوا نەئەکرا کە بتوانن بەهۆی شەڕەوە بەرزان لەناو بەرن، چونکە مەلا شەڕی نەئەکرد، دەرچوونی ئەو چەند رۆژانەی ئەو لەبەرزان، مەیدانی بۆ ئەوکەسانە چۆڵ کرد کە ئەو فیکرەیان هەبوو، توانیشیان بەهەموو جۆر کاربکەنە سەردڵی «شێخ ئەحمەد» و چی ئارەزوو ئەکەن پێی بکەن.

بێجگە لەمە چوونی عیزەت عەبدولعەزیز ـ بەیەک رۆژ پێش هەڵگیرسانی شەڕ ـ بۆ بەرزان و قسەکردن لەگەڵ شێخ ئەحمەدا و کار تێکردنی ـ لەگەڵ باوەڕی «شێخ ئەحمەد»دا کەهەمووشت ئەبێ بە جەنگ بیڕێتەوە، ئەمەش دیسان ئاگردانێک بوو بۆ ئەوە کە ئاگری شەڕی تیا هەڵگیرسێ... ئەمە و هەروەها بەدەرچوونی «مەلامستەفا» لەبەرزان و فەرماندانی حوکومەت بەهەموو دائیرە و نوختەکانی وڵاتی بەرزان بەوە کە هەر بەرزانیەک چووەلایان لەچەک رووتی بکەنەوە و ئیش و فەرمانیشی بۆ جێبەجێ نەکرێ. لەلایەکی تریشەوە پڕ کردنی هەر چوار دەوری «بەرزان» لە نیروی حوکومەت بۆ کوشتنی بەرزان، ئەمانە هەموو ئەکەنە کارێ کە ئەگەر «مەلامستەفا» بشگەڕێتەوە بۆ بەرزان، هەر تووشی ئەوەبێ کە شەڕ هەڵگیرسێ!.

وەکو لەم قسانەوە بۆمان دەرکەوت ئەگەر پیاوانی حوکومەت وکاربەدستەگەورە و بچوکەکانی حوکومەت دڵسۆز بوونایە بەرانبەر بە حوکومەت و بە میللەت، نەیانئەکردەکارێ لەبەرئەوە کە ئینگلیز ئیتر ئیشی نەماوە، بێنن میللەت بدەنە بەر بارانی گوللەی مەترەلۆز و بیانکەن بە خۆراکی بۆمبای فڕۆکەکان و لە پێناوی ئەمەدا زیانێکی زۆریش روو بکاتە حوکومەت!. کاربەدەستەکان ئەمەیان هەموو بۆ ئافەرینێک کرد، کەچی ئافەرینەکانیش هیچیان کەڵکێکی نەبوو بۆیان!.

ئەمەکەی رەوای هەق بوو پیاوێکی وەکو «ئاڵۆ بەگ» سەرۆکی عەشرەتی شیروان لەگەڵ دوو پیاویا بچنە نوختەی «مێرگەسوور» بۆ وەرگرتنی ئەو شەکر و چا و کوتاڵە کە گۆیا حوکومەت بۆی بڕیونەتەوە، کەچی لەباتی ئەوە شتەکانیان بدەنی پێیان بڵێن ئەبێ چەکەکانتان فڕێدەن و خۆشتان بگیرێن!. دیارە ئەمە سەر ئەکێشێ بەلای ئەوەوە کە لەملاوە «ئاڵۆبەگ» و لەولاوە [مەئمور مەرکەز] و چوار پۆلیس بکوژرێت و لەئاخرا نوختەی «مێرگەسوور» لەدەست حوکومەت دەرچێ!. یا «ئەسعەد خۆشەوی» بۆ ئیش و کاری تایبەتی خۆی بچێتە نوختەی «زیبار»، کەچی پۆلیسی حوکومەت گەمارۆی بدا و بیەوێ رووتی بکاتەوە!. ئەسعەد ناچارە بەهەر جۆر بێت ـ باچەند کەسێکیش بکوژێ ـ هەر خۆی دەربازکا!. یا لەلایەکی ترەوە هەندێ بەرزانی بچنە

نوختەکەی [بەرزان] بۆ وەرگرتنی تەعینات، کەچی نوختە بیەوێ بیانگرن! بێگومان ئەمانە ئەم جەورە هەڵناگرن، ئاخری کار ئەبێ وای لێ بێ کە نوختەکە لەژێر دەستی حوکومەت دەرێنن!.

***

لەپاش ئەوەکە ئەم کارەساتانە قەوما و حوکومەت ئەوەندەی‌تر چوار دەوری بەرزانی تەنیەوە و لەپاش ئەوەکە مەلامستەفا ـ ش گەڕایەوە، هیچ چارێک نەدۆزرایەوە بێجگە لەوە نەبێ کە قۆمیتەیەک لەگەڵ [شێخ ئەحمەد] و ئەفسەرەکانا بگرن و دەرمانێک بۆ ئەم دەردە بدۆزنەوە. ئاخر قسەیان هاتەسەر دووشت؛ یەکەم قایمکردنی خەتی خۆپاراستن، دووهەم تێگەیاندنی حوکومەتی عێراق و هەموو سەفارەتەکان لەم ئیشە ناڕەوایە کە بەرانبەریان ئەکرێت. لەبەرئەوە هێنایان لە پێشا بەمجۆرەی خوارەوە ناوچەکانیان قایمکردەوە:

١ـ خەتی رۆژهەلات لەژێر فەرماندەیی [شێخ محەمەد سدیق]دا بەیاریەدانی فەرماندەیی [عیزەت عەبدولعەزیز].

٢ـ خەتی ئاکرێ ـ جنوب ـ لەژێر فەرمانەیی [مەلامستەفا] خۆیدا بەیاریەدانی فەرمانەیی «جەلال ئەمین» و «محەمەد مەحمود».

٣ـ خەتی رۆژئاوا ـ بالندە ـ لەژێر فەرماندەیی «سالح عەبدولعەزیز»ی برای عیزەت‌دا.

ئەمجا مەلامستەفا بەمێژووی ٢٠ی ئاغستۆزی ١٩٤٥ وێنەی چەند نامەیەکیشی ـ کە وەکو لەخوارەوە باس ئەکرێ ـ نارد بۆ رەئیسی وزرای عێراق و بۆ سەفیرەکانی: چین، فەرەنسە، ئەمەریکا، سۆڤیاتی، ئینگلیز لەبەغدا. نامەکەش لەوێنەی ئەم شتانەی تیانووسیبوو:

(... ئێمە کە شۆڕشەکەی دوو ساڵ لەمەوپێشمان وەستان لەبەرئەوە بوو پیشانی هەموو کەسێکی بدەین کە ئێمە نامانەوی رووبەرووی حوکومەت بووەستین، [نوری سەعید] بڕیاری گەلێ قسەی چاکە و یارمەتی پێداین و پاشان خۆی رۆیشت و هیچی نەکرد، کە «حەمدی باچەچی» هاتەپێشەوە وتی من بۆتان ئەکەم. ماوەیەکی زۆر چاوەڕێمان کرد هیچمان دەست نەکەوت، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوە حوکومەت هێنای [بەرزان]ی پڕ کرد لە نوختە و پۆلیس و سەرباری ئەوەش هەر چوار دەوری [بەرزان]ی بە هێزی هەوایی و نەیروی سەر زەوی تەنیەوە. ئەمەشی گۆیا بەناوی مناوەرەوە هێناوە، کەچی لەگەڵ ئەوەدا بۆ مناوەرە نیە بەڵکو بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم شتانەی خوارەوە بوو:

١ـ سەرۆکی عەشایرەکان لەوەختی خۆیا دیدەنی منیان کردبوو، بە رێ و شوێنی عەشایری منیش ئەبێ دیدەنیان بکەمەوە، لەبەرئەمە من چوومەوە بۆ لایان، کەچی حوکومەت فەرمانێکی بۆ دەرکردم گۆیا من نابێ لە شوێنی خۆم بزووم، بەڵام من لەبەرئەوە کە قانونی عێراق شتێکی وای تیا نیە نەیەڵێ پیاو دیدەنی لەکەس و کاری بکا، گوێم نەدایە و رۆیشتم.

٢ـ کەمن لە «بەرزان» دەرچووم موتەسەریفی هەولێر فەرمانی کردبووە سەر نوختەکانی [زێبار] و بەرزان و مێرگەسوور کە هەر بەرزانیەک بۆ ئیش و کار هاتەلاتان بیگرن و ئیشی بۆ

جێبەجێ مەکەن!.

٣ـ «ئالۆبەگ» ـ کە خاڵی ئێمەیە و یەکێکە لەسەرۆکی عەشایرەکانی «بەرزان» ـ بەنیشی تایبەتی ئەچێتە نوختەی «مێرگەسوور»، بەبێ ئەوە ئاگای لە هیچ بێ لەلایەن یەکێ لە پۆلیسەکانەوە ئەکوژرێت. سێ کەسی کە لەگەڵابووە بە ناچاری بۆ ئەوە ئەوانیش نەکوژرێن دەستئەکەن بە شەڕکردن، لە ئاخرا پۆلیسەکان هەندێکیان ئەکوژرێن و ئەمان نوختەکە ئەگرن.

٤ـ لەبەرئەو فەرمانەی موتەسەرپفی هەولێر کە کردبوویە سەر نوختەکانی «بەرزان» لە لایەن گرتنی ئەو بەرزانیانەوە کە ئەچن بەشوێن ئیش و کاری خۆیانەوە لەدایەرەکانی حوکومەت ئەبێ بگیرێن، «ئەسعەد خۆشەوی» کە ئەچێ بۆ زنبار، پۆلیس ئەیەوێ بیگرێ، ئەمیش ناچار بەشەڕکردن خۆی لەدەستیان دەرباز ئەکا.

٥ـ حوکومەت ئەیروی عەسکەری لەئاکرێ و بافستیان و هێزی پۆلیسی لەناوچەی «رێکانی» کۆکردۆتەوە، بەبێ ئەمە کە هیچ لەبەینا هەبێ ئەیەوێ ئاگری شەڕ هەڵگیرسێنێ و ئەم کوردە بێ گوناحانەی ئەم ناوە لەناو بەرێ.

جەناب سەفیرا. لەکاتێکا کەمن ئەم نامەیەتان بۆ ئەنووسم، ژن و منداڵی دێهاتی ئەم ناوە لەژێر بۆمبای حکومەتی عێراقی‌دا ئەپلیشێنەوە. لەبەرئەمە تکا ئەکەم کە حوکومەتی خۆتان لەم کارەساتە تێبگەیەنن، بۆ ئەوە بەندەکانی پەیمانی «ئەتلەنتیک» بهێنرێنەوە یاد؛ ئەو پەیمانە کە ئەڵێ هەر قەومێ ئەبێ ژیانی خۆی لەدەست خۆیا بێ، بۆ ئەوەش کە نەیەڵن دیکتاتۆری جانەوەرانەی عێراق ئەمجۆرە شتانەمان لەگەڵ بکەن... ئیتر هیوادارم ئەو دەوڵەتانەی کە چاوێری حقوقی قەومە بێ هێزەکان ئەکەن، هەربژین.).

* * *

ئەوە بوو فەرماندەری خەتەکان هەریەکەیان چوونە سەر ئیشی خۆیان، «مەلامستەفا»ش لە رۆژی ٢١ی ئاغستۆزدا بە خۆی و شەست کەسەوە چوو خەتی ئاکرێ ـ ی قایمکرد، لەرۆژی دوایدا لە گوندی «سفتە» بوون، لەلایەن هێزی هەوایی حوکومەتەوە بۆردمانێک کران. لەرۆژی ٢٤ی مانگدا «مەحمود ئاغای زنباری» بە خۆی و ٤٠ کەسەوە لە ئاوایی «هەرند» دایە باڵی و پێکەوە گەیشتنە کێوی «پیرس». رۆژی دوایی بەسەر پیرس دا تێپەڕین و چوونە دێی «گۆبیش».

لەم کاتەدا خەبەر وەرگیرا کە گۆیا فەوجی ٥ لە ئاکرێ و فەوجی ٤ لە رەواندزەوە فیکریان وایە رۆژی ٥ی ئەیلوول بدەن بەسەر ئەم هێزەی «مەلامستەفا» دا!.

گومانی تێدانەبوو کە ئەم دوو فەوجە لەو دوو خەتەوە بهاتنایە، هێزی «مەلامستەفا»یان ئابلۆقە ئەدا و بەتەواوی شپرزەیان ئەکرد؛ چونکە ناچار ئەبوون بەوە کە ئەمانیش لەدوولاوە شەڕبکەن، دیارە بەرگەی شەڕکردنی هەر دوولاشیان نەئەگرت. لێرەدا فەرماندەی گشتی ـ مەلامستەفا ـ پسپۆری باری جەنگی خۆی خستە کار؛ هێنای «محەمەد ئەمین سیرخان، قرتاس زنباری، عەزیزئاغای زراری و رەشید زنباری» بانگ کرد و هەر یەکە «دە» تفەنگچی دانی، پێی وتن

شەوی ٢٧ی ئاغستۆز بچن لەدەوروبەری کێوی «ئاکرێ» هەموو بە یەکجار لەیەک کاتا شیلکێک بکەن بەسەر ئەو فەوجی پێنجەداکە ـکێوی ئاکرێ ـی گرتووە ـ بەمەرجێکیش کە یەکی لە چوار فیشەک زیاتر نەتەقێنن، پاشان بەبێ ئەوە چاوەڕێی دوایی بکەن بگەڕێنەوە!.

حەقیقەت ئەمانە بەوجۆرە کە قەرماندە پێی وتبوون ئیشی خۆیانیان کرد و فەوجەکەیان شڵەژاند، فەوجی سەرباز بەجۆری شڵەژا پێی نەکرا لە رۆژی ٥ی ئەیلوولا وەکو ئەو نیازە کە هەیانبوو لەگەڵ فەوجی چوارا یەک بگرن و هێزی قەومیی [مەلامستەفا] بخەنەناو!.

مایەوە سەر فەوجی ٤ کە لە خەتی رەواندزەوە بەسەرکردەیی «قەیسەر هورمز» وگەلێک لە دەستە و دایەرەی «شێخ رەشیدی لۆلان»ەوە هاتبوون وگەیشتبوونە «بادلیان». ئەوە بوو ئیتر لەبەرئەو تەگەرەیەکە کەوتە رێی فەوجی ٥ بۆی نەکرا بێت و بداتە پاڵ فەوجی چوار. سەرکردەی هێزی میللی ئەم خەتەش «شێخ محەمەد سدیق» بوو. کەواتە با لەجەنگی «بادلیان»دا ئەو نامەیە بخوێنینەوە کە «شێخ محەمەد سدیق» لەم رووەوە نووسیوویە بۆ فەرماندەی گشتی ـ مەلامستەفا:

«... فەوجی ٤ی «بافستیان» لە بەیانی ١٥ی ئاغستۆزدا لە رێگەی «دیانە ـ بادلیان»ەوە هات و فیکری وابوو لە «کۆنەگوند»ەوە بێتە پشتی «شێتنە» و پشتمان لێ بگرن!. فەرماندەی «کۆنەگوند» ـ «نور و شیروانی» بە دە کەسەوە بە رەنگاریان بوو، جەنگێکی شەش سەعاتی لەگەڵ کردن، لەدەمە دەمی نیوەڕۆ دا نزیکەی چوار هەزار هەنگاوێک چوونە دواوە و لەوێدا خەتی خۆپاراستنمان دانا، لەدەمە دەمی ئێوارەدا فەوجی چوار شکان و گەڕانە دواوە. ئەو زیانەی کە لێیان کەوت بەمجۆرە بوو:

[قەیسەر هورمز] ـ فەرماندەی ئەیرو ـ کوژرا. بریندارى فەوج ٣٠٠ کەس، کوژراویان ٢٠٨ کەس. ئەوشتانەشیان کە کەوتە دەست هێزی میللی خۆمان ئەمانەبوون:

٥٠ تفەنگ، ٢٠ سندوق فیشەک، هەندێ نارنجۆک، دوو خەمپارە ـ خەمپارە وەکو تۆپێکی بچوک وایە ـ سێ مەترەلۆزی سووک، یەک مەترەلۆزی گەورە. دەزگایەکی لاسلکی.

لەئێمەش تەنها دوو پێشمەرگە بریندار بووە، خۆیشم بە پریشکی تۆپی ئەوان تۆزێ بریندابووم و ئێستە فەرماندەیی ئەم خەتەم داوەتە دەست «محەمەد ئاغای مێرگەسوور». تا، تاقە پێشمەرگەیەک لە ئێمە بمێنێ لەرێگەی حەقپەرەستیدا بەپشتیوانی خوا نایەڵین دوژمن بستێک پێشکەونت.

ـ«فەرماندەی خەتی رۆژهەڵات ـ شێخ محەمەد سدیق!.».

* * *

«جەنگی نەهلە»: «نەهلە» دەشتێکی پڕ ئاو و بێدارە، گەلێ گوندی تێدایە کە هی سوورچیەکانن، چەند گوندێکی ئاسووریشی تێدایە، کێوی «پیرس» لە شیمال و کێوی ئاکرێ لە جنوب دەشتەکەیان گرتۆتە باوەش. لای رۆژهەڵاتی عەشرەتی سوورچی و لای رۆژئاوای عەشرەتی زیباری و «دەشتی»یە. لە کێوی «ئاکرێ»وە سێ رێگە دێتە خوارەوە لە نزیکی گوندی

«گۆییش» ئەبن بەیەک و لەوێ بەسەر کێوی [پیرس] دا ئەچن بۆ زێبار. ئەم سێ رێگەیە تەنها یەکێکیان نەبێ بەکەڵکی ئەوە دێت کە وڵاخی پیا بڕوا، ئەوانیتر بێجگە لە پیادە، بەکەڵکی هیچی تر نایەن.

شەوی ٨ی ئەیلوول فەرماندەی گشتی ـ مەلامستەفا ـ محەمەد ئەمین میرخان و عەزیزئاغای بانگ کرد پێی وتن هەر یەکە لەگەڵ «دە» تفەنگا بچن راست و چەپی کێوی ئاکرێ ـ رووبەرووی دەشتی نەهلە ـ بگرن و خۆیان حەشاردەن، پێشی وتن تا لەلایەن منەوە تەقە نەکرێ، ئێوە هیچ تەقە مەکەن. «سەعیدی ئالۆ بەگ»یشی بە «دە» تفەنگەوە ناردەلای دەستی چەپ رووبەرووی دەستەی عەزیزئاغا. خۆیشی بە ٢٠ تفەنگەوە لەداوێنی کێوی «پیرس»ەوە رووبەرووی دەشتی نەهلە لێی دانیشت.

ئەمجا لەبەرە بەیانی رۆژی ٨دا نەیروی حوکومەت بە تۆپ و فڕۆکە بۆ رێنچکەشکاندن دەستی کرد بە بۆردمانی خەتی مەلامستەفا و، سەربازی پیادەش بە شوێنیەوە. ئەوەندە هەبوو لەلایەن دەستەی [مەلامستەفا]وە هیچ تەقەیەک نەبوو!. [فەوج] لەمە دڵنیا بوو کە رێگەی بۆ چۆڵ کراوە و هیچ کۆسپێکی لە رێدا نییە، بە بێ ترس ملی رێی گرت و بەتەواوی چووە ناوەوە. کە زانرا وا هەموو چوونەتە ناوەوە، لەلایەن دەستەی فەرماندەی گشتی یەوە شێلکێکیان کرایەسەرا. سەرباز بە جارێ شڵەژا و بۆ ئەوە شوێنێک بۆ شەڕ بدۆزێتەوە گەڕایەوە بۆ دواوە، لە گەڕانەوەیا لەلایەن دەستەی «محەمەد ئەمین میرخان»ەوە درانە بەر گوللە!. ناچار بەلای راستا بای دایەوە، هەر کە بای دایەوە لەلایەن دەستەی [عەزیزئاغا]وە دەستڕێژیان لێکرا!. ئەمجا بۆلای چەپ لایان کردەوە، لەوێش دەستەی سەعید بەگ دایانە بەرا!.

ئەم لەشکرە بەبێ ئەوە بتوانێ دەستێک بکاتەوە، تا بانگی شێوان کەوتە ژێر رەحمەتی بارانی گوللەوە. ئەو رۆژە ١٥٠ سەرباز و ٣ ئەفسەر کوشتاریان دا لەگەڵ ٤٠٠ کەس بریندارا. لەهێزی قەومی نە کوشتار هەبوو نە بریندار. ئەو تالآنەش کە کەوتە دەست هێزی میللی هەر لەو رۆژەدا ئەمانە بوون: تۆپێکی گەورەی کوێستانی، دوو مەترەلۆزی سووک، ٢٨ تفەنگ، ١٠ سندوق فیشەک، ١٦٨ گوللە تۆپ، چوار سەد بار ئازوخە شتومەک بەوڵاخەکانەوە.

نەیروی حوکومەت تا سێ رۆژ بەوجۆرە بە ئابڵوقە دراوی مایەوە و هیچی پێ نەکرا، هەرچەند حوکومەت بەهەڕەشە و بەفڕۆکە و بەخواهشت خەریک بوو نەیروی پێ رزگار نەکرا و نەیرو کەوتە ژێر رەحمەتی خۆبەدەستەوەدانەوە. ئیش کەوتە دەقیقە و سەعات.

وەزارەتی «حەمدی پاچەچی» و وەزیر داخلیەی «مستەفا عومەری» بوو. ئینگلیز دەستێکی هێنا بە سمێڵیا و سمێڵەکەی بزواندەوە. بزواندنەوەکەش ئەوە بوو مەسەلەکوردیەکەی وەرگرت کە «ئەگەر داریوازی لەخۆی نەبێ شەق نابێ» بە قسەی ئەو، پارە و مەرحەبایەکی زۆر دانرا بۆ ئەوەکە [مستەفا عومەری] بە ئارەزووی خۆی لەو ناوەدا بلاوی کاتەوە وکوردەکان هان بدا بۆ بە گژا چوونی [مەلا مستەفا] و بۆ رزگارکردنی نەیروە ئابڵوقە دراوەکەی حوکومەت.

بە پەلەیەکی زۆر پەلە پارەیەکی بێ ژمارە رژێنرایە ئەو ناوە، زمانە لووس و پوسەکەی مشاورە سیاسیەکانی ئینگلیزی بەغدا و موسڵ و کەرکووکیش فریا کەوت! لەعەشایری سوورچی و زیباری دەستەیەکی کۆک، کۆکرایەوە، سەرۆک عەشیرەتەکانی ئەو ناوە، وەکو: «عەبدوڵلا شەرەفانی، مەجید حسەین‌ئاغا، شێخ جەلالی بریفکانی، ئەحمەدئاغای زیباری و شەوکەت زیباری» قسەیەیان دا بە حوکومەت کە فەوجی ئابلوقە دراو رزگارکەن. ئەمانە بە هێزێکی زۆری عەشایرەوە ـکە تا چوار سەد تفەنگ ئەبوو ـکەوتنە جەنگێکی مردن و ژیان لەگەڵ هێزی میللی [مەلا مستەفا]دا. لەئاخرا لە رۆژی ١٢ی ئەیلوولی ١٩٤٥دا مەلا مستەفا سەیری کرد هەرگوللەیەک کە بیهاوێژێ بەرسنگی کورد ئەکەوێ. بۆ ئەوە ئەمە روونەدا سەنگەرەکانی خۆی بە جێهێشت و ماوەی سەعات و نیوێک هەر لەکێوی «پیرس» کشایە دواوە. لەم کشانە دواوەی ئەودا فەوجە ئەیروەکەی حوکومەتیش لەئابلۆقەدان رزگاری بوو. هەرلە وەختە دا کە عەشایرەکان گوللەیان بە سنگی [مەلا مستەفا]وە ئەنا، «مەحمود ئاغا» زیباری ـکەتا ئەو وەختە لەگەڵ هێزی مەلا دابوو ـ ئەویش لێی کشایەوە و دایە پاڵ هێزی حوکومەت.

لە ماوەی ئەو پێنج رۆژ ئابلۆقە دانەدا هەر دوو هێزەکە حەو جار پەلاماری یەکیاندا. کارەساتی ئەم «ئەهلە» و «پیرس»ە هەموو دایرەکانی حوکومەت و دیواخانە سیاسیەکانی بە غدای پڕکرد و کەوتە دەم دانیشتووی ولاتەکانی [بەغدا] و [بەسرە]ش. زیانی کوژراو و بریندار لەم شەڕەدا لەهەر دوولا بەمجۆرە بوو:

لە هێزی حوکومەت کوژرا و ٣٨٠کەس. بریندار ٤٥٠کەس.

لەهێزی میللی عەزیزئاغای زراری ـکە فەرماندەی خەتی راست بوو ـ لەگەڵ چوار کەسی ترا شەهیدبوون، برینداریش گەیشتە چوار کەس.

* * *

شەڕی «هەودیان» و «مەزنە»: رۆژی ٢ی ئەیلوولی ١٩٤٥ فەوجی ٤ لەلای راست و فەوجی ٣ لەلای چەپەوە لەرێگەی «بافستیان»ەوە بۆ «مەزنە» بەرێکەوتن. ئەیروی میللی لەژێر فەرماندەیی «محەمەدئاغا»ی مێرگەسوور و یاریەدانی «نورو شیروانی» بە خۆیان و بەهەندێ پەنابەرانەوە بۆیان لە ئەشکەوتەکانی هەودیانا ـکە لەمەزنەوە سەعاتە رێگە یەک ئەبوو ـ خۆیان حەشار دابوو. کە فەوجەکان تێپەڕین ئەمان بۆیان دەرپەڕین و دەستیان دایە تفەنگ لێیان، هێزی هەوایی حوکومەت کە بەمانەی زانی کەوتە بۆم بۆردمان کردنیان، گوێیاد، بەو بۆردمانە ئەداو وەکو شێری برسی خۆیان دا لەئەیروی حوکومەت، هێزی حوکومەت بە تۆپ و دەبابە بەرەنگاریان بوون. هێزی میللی لەبەر شالاوی دەبابەکان تۆزێ کشانەوە تا دەبابەکان وەستانەوە، ئەمجا پەلاماریان دانەوە، بە شکاندنێکی زۆر خراپ شکاندنیان. زیان لەم شەڕەدا بەمجۆرە بوو:

کوژراو لە هێزی حوکومەت ٣٠٠، بریندار ٤٥٠. لەهێزی میللی تەنها دووکەس بریندابوو هیچی تر. تالانێ کە کەوتە دەست هێزی میللی: ٣ تۆپی کوێستانی، ٣ مەترەلۆز، ٤٨گوللە تۆپ،

٢٠ سندوق فیشەک.

* * *

شەڕی «هەرن»: «هەرن» گوندێکە بە سێ سەعات رێگە کەوتۆتە رۆژئاوای بەرزانەوە. لێرەدا عەشایرەکانی زێبار و بادینان ـ کە حەوسەد تفەنگچیەک ئەبوون ـ لەژێر فەرماندەیی چەند ئەفسەرێکی عێراقی و هەشت سەرۆک عەشایری [ زێبار]و [بادینان]دا بۆ بەربەرەکانی مەلا مستەفا و شەڕ لەگەڵ کردنیا خۆیان داکوتابوو، بەتەلسز ـ یش هەمووکاتێ کارەساتی خۆیان ئەگەیاند بەنەیروی عێراقی.

لەبەرئەوە کە «هەرن» کەوتبووە پشت کێوی «پیرس»ەوە، سەنگەرگایەکی بە هێز بوو بۆ ترساندنی هێزی میللی مەلا مستەفا. فەرماندەی گشتی ـ مەلا مستەفا ـ ئەمەی ئەزانی و ئەیویست پیلانێکی وا بێنێتە پێشەوە کە ئەمە لە ناوا هەڵگرێ. لەبەر ئەمە هێنای پیرس ـ ی بەجێهێشت و لەگەڵ ٣٠ تفەنگدا بڕیاری پەلاماردانێکی هێزی «هەرن»ی دا و بە شێخ سلەیمان ـ یشی وت کە ئەویش بە ٢٨ کەسەوە لەشوێن ئەمەوە بێت. لە شەڕی پێشوودا تۆپێکیان بە تالانی لە هێزی دەوڵەتەوە دەستکەوتبوو، لەم وەختەدا ئەو تۆپە ـ ش لە دێی «هەرفتە» بوو ـ کەماوەی بەینی هەرفتە و هەرن شەش هەزار یاردەیەک بوو. تۆپەکەش گوللەی بەماوەی حەو هەزار یاردە فڕێ ئەدا. لەبەرئەمە پێویستیەکی وانەبوو بەوەکە تۆپەکە لەو شوێنەی خۆی بگوێزرێتەوە، بەڵکو هەر تۆزێ چەخماخەکەی بهێنرایەتە خوارەوە، راست نیشانەکەی ئەبوو بەناو دێی «هەرن» و هێزی حوکومەت.

«مەلامستەفا» بەعیزەتی وت لەو وەختەدا کە هێزی ئەم ئابڵوقەی نەیروی حوکومەت ئەدا، ئەویش ئەو تۆپە بگرێتە هەرن و هێزەکە، بەمجۆرە ئەتوانن هێزی حوکومەت بشڵەژێنن و شەڕەکە بەرنەوە.

فەرماندە ئەم پیلانەی دانا و ئەمجا خۆی و هێزەکەی پەلاماری «هەرن» یان دا و عیزەتیش لەولاوە دەستی کرد بە تۆپ هاویشتن، بەلام بە هیچ جۆر گوللەی تۆپ نزیکی نیشان نەئەکەوتەوە؛ واتە هەر زۆر زۆر نزم بوو!. فەرماندە خەبەری بۆ نارد کە تۆپەکە نزیک بخاتەوە، چونکە لەو حاڵەدا بەهیچ جۆر کەڵکی نییە، ئەم خەبەرەی بۆ عیزەت نارد و خۆیشی بە چاوەڕێی گواستنەوەی تۆپەوە تا نزیکەی شەش سەعاتێک لەشوێنەکەی خۆیا خەریکی شەڕ بوو، سەیری کرد هیچ خەبەرێک لەتۆپەوە نییە و بەڵکو جاران تەقەیەکی لێوە ئەهات، ئێستە ئەو تەقەیەش نەما!. هەر لەو کاتەدا خەبەرێکیشی وەرگرت کە نەیروی حوکومەت بەهەموو هێزی عەشایرەوە ئەیانەوێ لە [پیرس] بدەن. فەرماندە لەترسی ئەوە نەوەک پیرسی لەدەست دەرچێ، لەبەرئەوەش کە هیچ دەنگێکیش لە تۆپەکەوە نییە، ناچار ئابڵوقەکەی بەرەڵا کرد و بەخێرایی خۆی گەیاندە «پیرس».

مایەوە سەرئەوە کە ئایا «عیزەت عەزیز» بۆچ لە بە ئەنجام گەیاندنی فەرمانی فەرماندەدا

درێغی کرد و بۆچ تەقەی لە تۆپەوە نەهێنا؟.
گۆیا لەو وەختەدا کە فەرمانی [مەلامستەفا]ی پێگەیشتووە بۆ نزیک خستنەوەی تۆپەکە، خەبەرێکی تریشی وەرگرتووە کە مەلا مستەفا سەنگەر و ئابلۆقەکەی، بەجێهێشتووە و ڕۆیشتووە!. لەبەرئەمە ئەمیش تۆپەکەی هەڵگرتووە و بەرەودوا بۆتەوە!!. لەگەڵ ئەوەشا ئەو خەبەرەی ئەو ـ ئەگەر بیستبێتی ـ هیچ بناغەیەکی نەبووە و درۆبوو.
[تەئریخ] ئەبێ ئەوە بزانێ ئەم کردەوەیەی [عیزەت عەزیز]، گەورەتر بەڵایەک بوو کە هاتە ڕێی بزووتنەوەی قەومیی ئەو ڕۆژە، جا ئەو ئیشەی بەهەڵەیی یا لە ڕووی شتێکەوە کردبێ، خۆ بوو بەهۆی شکاندنی هێزی میللی و هێزی [بەرزان]، وەکو کاسەیەک بوو کەشکا، ئەشکێ!.

* * *

شەڕی کێوی «پیرس»: ٢٥ی ئەیلوولی ١٩٤٥ بوو. فەرماندە لە کێوی [پیرس] بوو، لەگەڵ ٦٠ تفەنگچیەکی ئازادا بۆ خۆپاراستن. لەماوەیەکی پێنجسەد مەتریدا سەنگەرەکانی خۆیان قایمکرد. ئەمەیان کرد، بەڵام کێوی [پیرس] لەلایەن دوژمنەوە لەهەموولایەکەوە ئابلۆقە درابوو؛ عەشرەتی سوورچی بە ٣٠٠ تفەنگەوە لەلای چەپەوە هێرشیان کرد و «مەلا عەلی» ژاژۆکی ـیان ـکە لەلایەن هێزی میللیەوە پاراستنی ئەو خەتەی پێ سپێرابوو ـگیرابە دواوە. لەلای ڕاستەوە عەشایرەکانی بەرواری، براشی، شەرەفانی و دۆسکی بە پێنجسەد کەسەوە ئەوانیش پەلاماریان دا. لەلای جنوبەوە فەوجی ٥ بەیارمەتی هەشت تۆپ و بۆم بۆردمانی پێنج فڕۆکەوە سنگیان نایە پێشەوە. لە پشتیشەوە عەشرەتی زێباری بە چوارسەد تفەنگەوە دەستیان پێکردا!. لەناو ئەم هەموو ئاگربارانەدا هێزە ٦٠کەسیەکەی میللی تا بانگی شێوان بەرانبەریی ئەم لێشاوانەیان کرد و نەیانهێشت پێش کەون. ئەمجا کە دنیا تاریک بوو، شوێنەکەی خۆیانیان بەجێهێشت و لەڕووباری «مەزن» پەڕینەوە، خۆیانیان گەیاندە «هەرتە» و لەوێ خەتی خۆپاراستنی ژیان و مردنیان دامەزراند. هەر لەم کاتەدا [مەلامستەفا] خەبەری نارد بۆ «شێخ ئەحمەد» بۆ ئەوە عەشرەتەکەی خۆیان لە بۆسبای فڕۆکە و گوللەی تۆپی بێئامانی دوژمن بپارێزن، ئەبێ هەرئێستە گوندەکانی خۆیان چۆڵ کەن و بچنە پشت چیای «شیرین» و ناو عەشرەتی «شێروانی». لەڕاستی دا هەر لەو شەوەدا ئەمانە هەموو کران!.
شەوی ٣٠ی ئەیلوول خەبەرێک لە «سەیید عەزیز سەیید عەبدوڵڵا»وە هات: لەگەڵ [سەیدمسلیح] و هەندێ تفەنگچیدا ئەوا لەسەر سنووری ئێران و عێراق لە «کانیڕەش» چاوەڕێی فەرمانی فەرماندەی گشتی ئەکەن. فەرماندەش ـ مەلامستەفا ـ خەبەری بۆ نارد کە ڕێگەی «کانی ڕەش ـکێلەشین» بپارێزێ و ئێمە ئەگەین.
هەرا تا ئەهات گەرمتر ئەبوو، [تۆپ] و فڕۆکە و گوللەی دوژمن. هەتا ئەهات زیاتر پاڵی ئەنا بەو هێزە میللیە نەترسەوە، هەچ ڕێگەیەک هەبوو بۆ کوشتن و لەناوبردنی بەرزانیەکان هەموویان گرتبوو، لەگەڵ ئەمەشا بەرزانی نەترس، بەرزانی کۆڵنەدەر هەچ ئاژەڵ وماڵێکی هەبوو لەگەڵ

ژن و منالّ و خاوخێزانا بەدەم شەڕەوە گەیشتنە «کانی ڕەش». لەوێدا فەرماندەی گشتی بەدووسەد تفەنگچییەوە، ئاخر کەس خێزان و مالّاتی خستە پێش خۆیەوە و بەو هێزەوە لەبۆمبای دوژمن پاراستنی. دیسان لەگەڵ ئەوەدا کە هێزی دوژمن بە هەموو فڕۆکە و تۆپ و عەشایریەوە کەوتە کۆششی ئەوە کە پێشیان لێ بگرێ و ڕێگەی «کێلەشین»یان نەداتێ، لەگەڵ ئەمەشا هێزی نەبەزی بەرزانی لەرۆژی ١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥دا زۆری زاڵمان و ویژدانی ناڕەوای حوکومەتی ئەو وەختەی عێراق، پێیانی لەمەڵبەندی باوباپیریان بڕی و چوونە خاکی ئێرانەوە، بۆ ڕەوانەکردنیشیان لەدەنگی نرکەی گوللە تۆپ و هاژە و گفەی بۆمبای فڕۆکە نەبێ، هیچی تر نەبوو!!... جارێ با ئەمان لە ئێران بمێننەوە بزانین لە عێراقا چی ڕوویدا؟:

* * *

کە کەوتە سەرەتای ساڵی ١٩٤٥ وردە وردە ئەوە دەرکەوت کەوا هاوپەیمانەکان شەڕ ئەبەنەوە، سیاسەتی ئینگلیز لەکوردەواری دا بەتەواوی گۆڕا، بەتایبەتی بە جۆرێکی‌تر سەیری [بەرزان] ئەکرا!. لەبەرئەمە لەمارتی ١٩٤٥ دا پشتی مەتاڵ کرایە «مەلامستەفا» و ئینگلیزەکان لەلایەک و نۆکەرەکانی لەلایەک ئەیانویست کاروفەرمانی بەرزان بگۆڕن بە بارێکی‌ترا. ئەو هەموو دڵخۆشی و پەیمانانە کەتا ئەو وەختە دابوویان، هەمووی وەکو لەماڵی «فاتەی تەڵەمشک» دەرچووبێ وابوو، هیچی نەبرایە سەر! لەگەڵ ئەوەدا بە ئەنجام گەیاندنی زۆرتر لەپەیمانەکانیان لەنیوەی ئەوپارەیە زیاتری تێ‌نەئەچوو کە «مستەفا عومەری» وەزیری داخلیە لە تەموزی ١٩٤٥ دا تەرخانی کرد بۆ بەگژا چوونی بەرزانیەکان، یا بۆ گیرافانی هەندێ کەسیش کە لەماڵی خۆیانا دانیشتبوون!. دیسان چواریەکی ئەو پارەیەشی هەر نەئەویست کە حوکومەتی [حەمدی پاچەچی] لەسەرەتای مانگی ئابی ١٩٤٥ دا دایبا بۆ وەزارەتی جەنگ بۆ ئەوە بیدەن بە «بۆمبا» و بە فیشەک بچن خوێنی کوردەکانی «بەرزان» پێ بڕێژن!.

باشچاوشەکانی حوکومەت هەریەکە لەلایەکەوە حاقایقیان ون ئەکرد و هەریەکە لەلایەکەوە خەریک بوون بۆ ئەوەکە ئیشی [بەرزان] بە جۆرێکی ناڕاستی پیشانی بدەن تا لە پێناوی ئەمەدا خۆیان تۆزێ پایەکەیان بەرزبێتەوە، یا چوار پول بخەنە گیرفانیانەوە!.

بەیاننامە یەک لەسەریەکەکانی موتەسەڕیفی هەولێر کەدەری ئەکرد و ئەیوت: حوکومەت قانونی لێخۆشبوونی گشتی بۆ بەرزانیەکان دەرکرد و ولّاتەکەیانی ئاوەدان کردەوە و بەخۆڕایی چەند هەزار تەنێ دانەوێڵەی بەسەریانا بلاّو کردەوە هەمووی پۆشتەکردنەوە و تا بیناقاقایان شەکر و چای پێدان و ولّاتەکەیانی پڕکرد لە خەستەخانە و قوتابخانە و هەمور ولّاتەکەیانی کرد بە بەهەشت!. کەچی لەگەڵ ئەمانەدا «مەلامستەفا» هەستا و شیری لەڕووی حوکومەتا کێشا و قەدری ئەم ناز و نیعمەتەی نەزانی، کە واتە ئەبێ حوکومەت بەهەموو هێزێکیەوە بدا لەبەرزان و داری بەسەر بەردیەوە نەیەلێ!.

[موتەسەڕیف] ئەم قسە خۆشانەی بەمجۆرە ئەخستە بەر چاوی شەعبی عێراقی و بەمجۆرە

قسانە باوەڕی [شەعبی عێراقی] ڕانەکێشا بۆلای تاکی ترازوی حوکومەت. بەڵام ئایا ئەوەی نەئەزانی کە بەهەزاران هەزار، بەڵکو بەملیۆن هەیە کە بڕوا بەم قسەیە ناکا، چونکە ئەگەر دەیەکێکی ئەم قسانە ڕاست بوونایە [بەرزان] خوێنی خۆیانیان لێ زیاد نەبوو بێنن وەکو جۆگەلەی ئاو بیڕێژن!. ئەگەر پیاوانی حوکومەت و کاربەدەستانی حوکومەت دڵسۆز بوونایە بەرانبەر بە [شەعب] هیچ ناکۆکیەک لەبەینی میللەت و حوکومەتا رووی نەئەدا. مەسەلێکی کوردیە ئەلی «سەگ لە کولێرە ڕاناکا!.». دیسان هەر مەسەلێکی کوردیە ئەڵێ: «کاسە، کەپڕ بوو ئەڕژێ!.».

ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە پەیتا پەیتا [دیوانی وزرا] بەیاناتی دەرئەکرد و هەموو خراپەیەکی نسبەت ئەدایە پاڵ «مەلامستەفا» و هەموو چاک، و عەدالەت و خواناسی و نان بدەیەکیشی ئەدایە پاڵ خۆی! شاهیدی ئەم قسەیەش بەیانەکەی ٨ی ئابی ١٩٤٥یتی کە دای و وتی: «حوکومەت ئەیویست گەلێ چاکە بکا لەگەڵ [مەلا مستەفا]دا، بەڵام مەلا قبوڵی نەکرد، لەبەرئەوە ناچارین ئەو وڵاتە بخەینە ژێر ئیحتیلالی عەسکەریەوە.».

توخوا! ئەوکەسەی ئەم کتێبە ئەخوێنێتەوە، یابۆت ئەخوێنرێتەوە، کەس هەیە چاکە و پیاوەتی لەگەڵ بکرێ و نەیەوێ؟!... مەلا مستەفا تا تەئریخی ٨ی ئابی ١٩٤٥ قسەی هەزار چاکەیان پێدا، چارەکە یەکی تاقەقسەیەکیان بۆ نەهێنایە دی، ئیتر چۆن بڕوا بەم قسانە ئەکا؟!.

لە ١٢ی ئابی ١٩٤٥دا لەسەر زمانی «مودیری دیعایەی عەمەوە» دیسان بەیان بلاوکرایەوە لەسەر چەشنی هێنەکانی موتەسەریفی هەولێر کە حوکومەت، ئەو هەموو پیاوەتیانەی لەگەڵ [مەلا مستەفا]دا کرد و نیازی وابوو گەلێکی تریشی لەگەڵ بکا، کەچی مەلا مستەفا هیچی پێ هەڵنەگیرا و پاڵی بەهەموویەوەنا. لەبەرئەمە حوکومەت ناچار، بۆ ئەوە شاباڵی پڕ خەت و خاڵی عەدالەتی بەوناوەدا بلاوکاتەوە!. بە پێویستی ئەزانێ لەسەر خۆی گوناحبارەکان لەناو بەرێ». زۆر سەیرە ئەتوت «موتەسەریفی هەولێر» و دیوانی وزرا و مودیری دیعایە، تفیان کردووتە دەمی یەک!!.

ئەمجا لەرۆژی ١٩ی ئابی ١٩٤٥دا دیوانی وزرا بڕیاری دا بەدانانی دیوانی عورفی لە وڵاتی «زێبار» و دەوروبەری زێبار، هەر لەعەینی ڕۆژا فەرمانی شاهانەیان بۆ دەرکرد. پاش ئەمە - قائیدی قواتی عەسکەری - موسڵ و هەولێر و کەرکوک زیاتر پەرەی دا بە «عورفیە»کە و وتی لە ئیعتیباری ٢٨ی ئابی ١٩٤٥ەوە قەزا و شوێنەکانی هەولێر، ڕەواندز، ئاکرێ، ئامێدی و دهۆک - یش لەژێر ناوی عورفیا بێت!.

بەمجۆرە عورفی دامەزرا و هەموو هێزی عێراقی رووی کردە وڵاتی بەرزان و پاش ئەمانە دەستی کرد بە بەلاغ و بەیان دەرکردن.

بۆ ئەوە بزانی بەیانەکان لە حەقیقەتەوە چەندە نزیکن پێویستە شتێکی هەر لێ بخوێنیتەوە. بۆ وێنە، ئەمە بەیانێکە کە لە ١٩ی ئەیلوولی ١٩٤٥دا دەری کرد. دیارە ئەم بەیانە پاش ئەرای

«بادلیان، هەودیان و هەرن» کەوتبوو، ئەڵێ:

«زووتر حوکومەت تێی گەیاندن کە مەلامستەفا و هاوڕێکانی لەبەرئەوە دەستیان داوە بەیاخی‌گەری و خراپەکردنەوە، ئەبێ تەمێ بکرێن. بۆ ئەوەش کە [شەعب] ئاگادار بێ ئەمانە کرا:

(١ـ حوکومەت بەینی کێوی ئاکرێ و کێوی پیرس ـ ی لە یاخیەکان پاک کردەوە و زیانێکی زۆری لێدان.

٢ـ حوکومەت لەپاش چەند بەگژاچوونێک ناوچەی رۆژئاوای ئامێدی لە یاخیەکان پاک کردەوە.

٣ـ حوکومەت یاخیەکانی لەپاش چەند بەگژا چوونێک لەناوچەی «نیرو و رێکان» پاک کردەوە و چووە بەرزانەوە.

٤ـ حوکومەت یاخیەکانی لە «سیدەکان» دەرکرد و ئێستە ناوچەی برادۆست پاک بۆتەوە.

٥ـ حوکومەت لە با فستیانەوە پێش کەوت و هەموو ئەو ناوەی داگیر کرد و زیانێکی زۆری دا لە یاخیەکان.

٦ـ یاخیەکانی لای «مەلامستەفا» لە هەمورلایەکەوە ئابلۆقە دراون، هیچ چاریان نییە، یا تیاچوون، یا تەسلیم بوون!.

٧ـ عەشایرەکانی ئەو ناوە هەموو دوژمنی «مەلامستەفا»ن و هەموویان سەر بە حوکومەتن و بەهەر دوولاوە سەری مەلامستەفا ـ یان خوارد!).

ئەمە یەکێک بوو لەبەیان و بەلاغەکانی حوکومەت، تۆ بزانە بەلای ئەوەدا چوو کە زیانی حوکومەت لەم هەموو هەرایەدا چی بووە؟!. یا هیچ قسەیەکی لە زیانی ماڵیی ئەم هەرایەوە کرد کە لەو ماوەیەدا رووی دابوو؟!.

ئەی چەرخ!. ئایا ئۆباڵی خوێنە رژاوەکەی هەر دوو لا و زیان و خەسارەتە ماڵیەکە ـ کەماڵی شەعب بوو، ئەدرا بە گوللە و ئەنرا بە سنگی شەعبەوە ـ ئەچێتە ئەستۆی کێ؟!.

* * *

لەو سەردەمانەدا کە جۆش و خرۆشێکی کوردایەتی هەبوو لەناوا، کوردەکانی بەغدا دڵگەرمییەکی باشیان ئەنواند، «یانەی سەرکەوتن» هەبوو لەبەغدا، هەموو قوتابیە کوردەکانی دانشگا و دانشسارەکان و دانیشتوەکانی تری بەغدا هات و چۆی «یانە»یان ئەکرد و مەبەستیش لەیانەکە بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و گیانی برایەتی بوو لەناو کوردەکانا. بەتایبەتی دەستەی گەنجەکان و قوتابیەکان ئەم هەستەیان زۆر پێخۆش بوو، بەهەموو جۆر کۆشش ئەکرا بۆ بەرز بوونەوەی پایەی ئەو یانەیە.

لەسەرەتای نیسانی ١٩٤٥دا هەڵبژاردنی «یانە» هاتە ناوەوە بۆ دانانی ئەندام، لەرۆژی هەڵبژاردنەکەدا هەر کوردێک هەبوو ـ تەنانەت لەدەرەوەی بەغداش ـ هەمووی هات بۆ یانە. گەورە و بچوک، وەزیر و گزیر. لەدوایی هاتنی هەڵبژاردنا «نووسەری ئەم کتێبە» بێجگە لە ئەمین

زەکی بەگ لە هەموو کەس زیاتر دەنگی درایە.

ئێمە بەم کارەساتە نازانین، تومەس پیاوەگەورەکانی کورد ـ ئەوانەی لەبەغدا دانیشتبوون و چووبوونە یارێزەوە بۆ وزارەت و نیابەت بەناوی کوردەوە، مەبەستیان لەهات و چۆی «یانە»کەی ئەو رۆژەدا بچڕانی شتێک بووا.

ـ واتە کورسیەکی حوکم!- ئێمە - دەستەی گەنج و قوتابیان ئاگامان لەمەنیە. هەر بەگەڵێ وەخت پێش هەڵبژاردن هەندێ لەپیاوەکان ـ کەڵیان ماوەولێشیان مردوە ـ خەریکی نانەوەی تەونێک بوون بۆمان، چونکە بۆیان دەرکەوتبوو کە هەندێک لەئێمە ناکەونە ناو ئەو تۆڕەیە کەئەوان بەدەستیانەوەیەا. بەلأم تەونەکەیان بەتەواوی بۆ نەئەتەنرایەوە.

کارەساتی «مەلامستەفای بەرزانی» هاتەناوەوە؛ واتە توڕەبوونی حوکومەت لە «مەلامستەفا»، ئەو دەستەیە ئەمەیان بەهەل زانی بۆ تەواوکردنی تەونەکەا. راست بوو ئێمەش وەنەبێ بۆلابردنی زوڵم و جەوری حوکومەت بەرانبەر بە «مەلامستەفا» دەسمان لەوروسینا نەبوایە، بەلأم ئەو دەستەیە نەئەبوایە گوریس ئەوەندە بەتوندی رابکێشن تا بپچڕێ، مەلامستەفا و هەموو کەس بە خراپ بخەنە بەرچاوی حوکومەت بۆ ئەوە ئەوان بەپیاوچاک دەرچن و کورسیەکی چوار رۆژیەن دەست کەوێ؟!.

رۆژی ٦ی نیسانی ١٩٤٥ بوو، لەلایەن میریەوە گلێر کراینەوە: جەوهەر عەزیز، کانەبی عەزیز، موکەڕەم تاڵەبانی، کاکەحەمەی سەیید ئەحمەدی خانەقا، عەبدولقادر قەزاز، جەلیل هوشیار و نووسەری ئەم کتێبە «عەلائەدین سەجادی».

گلێرکراینەوە بۆ قاپی حەپسخانە و پاشان دراین بە دیوانی عورفی لەبەغدا. ئەو گوناحەی کەدایانە پاڵمان ئەوەبوو: «کەمەلامستەفا لەبەرزان بەتفەنگ شەڕ لەگەڵ حوکومەت ئەکا، ئەمانەش لێرە بەقەڵەم، میانەی هات و چۆشیان لەگەڵ مەلادا هەیە.).

دوو جار بۆ مرحاکمە براینە دیوانەوە، بۆجاری سێهەم دەنگ بڵاوبوو کە ئەیانەوێ بمانخنکێنن! بەرەکەتدا دزەییەکان و تاڵەبانیەکان و سەییدئەحمەدی خانەقاو گەلێ دەستەی‌تر بۆمان تێکەوتن تانەیانخنکاندین!. بەرەبەرە خەڵکی‌تر هەر ئەبرایە [عورفی] بەغدا و هەرکەس بەئەندازەی خۆی حوکمی ئەدرایە. ئەم عورفی بەغدایەش لقێک، بوو لەعورفیەکانی وڵاتی [بەرزان].

ئەو عورفیانەی کەلەهەولێرو وڵاتەکانی‌ترا بەهۆی کارەساتی بەرزانەوە لەساڵی ١٩٤٥دا دایانناو حوکمیان دا بەسەر ١١٥کەسدا، ٣٥کەس لەمانە بەخنکاندن، ئەوانیتر بەحەپس.

***

بەرزانیەکان کە لە ١١/١٠/١٩٤٥دا بەسەر «کێلەشین»دا ئاوابوون و چوونە ئێرانەوە، بەهەموو جۆرە چەکێکەوە رۆیشتن. خۆیان ٣ هەزارێک ئەبوون، تا ئەو وەختە کە دەرچوون ٩ فڕۆکەیان لەفڕۆکەکانی عێراق لە شەڕا خستبوە خوارەوە. کە چوونیش ٧ تۆپ، ١٠٠ مەترەلۆز، ٢٠ هەزار

فیشەک و چەند چرایەکی مخابرە و لاسلکی‌یان پێبوو. سەرەتا کە چوون لە وڵاتەکانی «نەغەدە، سۆفیان و جلّدیان» جێگیر بوون و خۆیانیان لەوێ دامەزراند.

ئەو سەردەمە کە ئەمان چوونە ئێرانەوە، حوکومەتی دیموکراتی کوردستان لە سابڵاخ هەبوو، ئەمە ترسێکی زل بوو بۆ حوکومەتی ئێران کە نەوەک مەلا بداتە پاڵ ئەو حوکومەتە و ئەو وەختە ئێران ئەوەندەی‌تر شپرزە ئەبێ. لەبەرئەمە ئامرفەوجی سەردەشت «سەرهەنگ پزیشکیان» بە فەرمانی [تاران] بە هۆی «مام عەزیزی قەرەنیاغای مامش»ەوە کەوتە قسەکردن لەگەڵ مەلادا، کە حوکومەتی ئێران بە هەموو جۆر یارمەتی بداو زەوی و زار بۆ بەرزانیەکان تەرخان بکا و خۆیشی بکا بە «نائیب» لە «تاران» و ئیتر نەچێ بەلای وڵاتی «سابلاخ»دا!... مەلا ئەم قسانەی نەچوو بە گوێچکەدا و قسەی ئێرانیەکانی گێڕایەوە.

وڵاتی «ورمێ» لەلایەن «زیرۆ» بەگی هەرکیەوە داگیر کرابوو لە ئێران. وڵاتی سابلاخ حوکومەتی «قازی» تێدا هەبوو، «تایەرئاغا» و «رەشیدبەگی مەندی» و هەموو عەشرەتی شوکاک و هەرکی دابوویانە پاڵ [قازی محەمەد]، چوونی مەلامستەفا بۆ ئەو وڵاتە، دەروویەکی تر بوو لە حوکومەتی کوردستان کرابووەوە. بە هۆی ئەفسەرانی هەردوولاوە مەلا و قازی گەیشتنە یەک، هێزی بەرزان ٨٠٠ تفەنگچی بەکار ئەبوو چووە ناو هێزی دیموکراتی کوردستانەوە. هەر چەندە هێزی [مەلامستەفا] لە وڵاتەکانی «سەقز» و «فەیزوڵلابەگی» و «بانە»دا خەریکی ئیش بوون و ئەو خەتانە رووبەرووی ئەوان کرابووەوە، بەڵام لە راستیدا لە ماوەی بوونی حوکومەتی دیموکراتی کوردستان و چوونی مەلا بۆ ئەو وڵاتە، زۆرتر پێشکەوتن و شەڕە زلەکانی ئەو ماوەیە هەر بەسەر شانی ئەمانەوە بوو، ئەمان بوون کە ببوون بە مایەی هێزی هەرە زلی حوکومەتی دیموکرات، بەڵکو تیشک و شەوقێک بوون کەوتبوونە ئەو ناوەوە.

* * *

بە هۆی شەڕی گەورەی دووەمەوە ئێران لە هەموولایەکەوە پڕی ببوو لە ئینگلیز و ئەمەریکا و روس، شەڕ دوایی هاتبوو پێویست بوو ئەمانە بە پێی پەیمانی خۆیان لە ئێران دەرچن. لە تشرینی دووەمی ١٩٤٦دا بڕیار درا کە ئینگلیز و ئەمەریکا لە شیمالی ئێرانەوە لە «ئێران» دەرچن، روس ـیش لە ئازرەبایجان بکشێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی.

کە ئەمان ئەم بڕیارەیان دا، ئیشی حوکومەتی «قازی محەمەد» رووی کردە سەر و لێژی، کە ئەو وای لێهات دیارە چۆنیەتی کاروباری بەرزانیەکانیش پەردەیەکی تری بەسەراهات!. تا ئەو وەختە ئەمان لە حوکومەتی کوردستانا رایان ئەبووارد و حوکومەتی ئێران بە هیچ جۆر ڕێگەی قسەی نەبوو، ئەوا ئێستە ئێران وڵاتی [سابلاخ] و حوکومەتی کوردستان دائەگرێت و ئەمانیش بەرانبەر بە حوکومەتی ئێران دیارە بێگانەن، ئێران ئەتوانێ پێیان بڵێ لە وڵاتما مەبن!. لەملاشەوە حاڵی عێراقیان ئەوەیە کە چاومان پێکەوت!.

«مەلامستەفا» لەبەرئەمانە هێنای وڵاتی سابلاخی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ ناوچەی

«سەندوس» و «نەغەدە»ی کردەوە بە شوێنی خۆی و تەلگرافێکیشی بۆ «قەوامولسەڵتەنە»ی سەرۆکی وەزارەتی ئێران لێدا و پیرۆزبایی ئەوەی لێکرد کە وڵاتەکەیان لە ئەیروەکانی بێگانە پاک بووەوە و تیایا دەرچوون. [قەوامولسەڵتەنە] وەڵامی تەلگرافەکەی بە زمانێکی شیرین دایەوە و داوای ئەوەی لێکرد کە بچێ بۆ [تاران] و بە دڵنیایی هەر قسە و باسێک، هەیە لەوێدا بیکا.

کە ئەم وەڵامە هاتەوە و لەم قسەیە تێگەیشتن. مەلا کۆنگرەیەکی لە «شێخ ئەحمەد» و ئەفسەرەکانی لای خۆی و پیاوەگەورەکانی [بەرزانی] درووست کرد و لەم رووەوە کەوتنە قسەکردن. ئاخر بڕیاریان هاتە سەر ئەوەکە بچێت بۆ [تاران] و لە کەیز و بەین تێبگا. لەملاشەوە هێزی [بەرزان] ئاگاداری شوێن و جێگەی خۆیان بە هەموو رووبینیەکەوە بکەن.

ئەمجا لە ١٩٤٦/١٢/١١ دا خۆی و میرحاج، عیزەت عەبدولعەزیز، نوری ئەحمەدی تەها، خالید بەگی زراری، محەمەد ئەمین میرخان، جەمیل تەوفێق بامەڕنێ. بەرێ کەوتن و چوون بۆ [تاران]. لەوێ بوون بە میوانی حوکومەت و بە هەموو جۆر رێزیان لێگیرا. «رەزمئارا» رەئیسی ئەرکانی ئەیروی ئێران بوو، چاویان پێی کەوت. مەلامستەفا [قەوامولسەڵتەنە] و شای دیدەنی کرد. لەپاش مانەوەی چەند رۆژێک ئاخر بڕیاری حوکومەتی [ئێران] لە گەڵیا هاتە سەر ئەم مەرجانەی خوارەوە:

(١ـ ئەگەر بەرزانیەکان ببن بە تەبەعەی ئێرانی، ئێران وەریان ئەگرێ و لەدەور و پشتی [تاران] شوێن و زەوییان بۆ دیاری ئەکا و دایانئەنێ بەو مەرجە چەک فڕێ بدەن.

٢ـ ئەگەر خۆ بیانەوێ هەموو لە ئێران نەمێننەوە، ئەو ١١٥ کەسە کە لەلایەن حوکومەتی [عێراق]ەوە حوکم دراون بەناوی پەنابەرانی سیاسیەوە پەنایان بە «ئێران» هێناوە، حوکومەت ئەوانە لە شوێنێک دوور لە سنووری عێراق دائەنێ.

٣ـ خۆ ئەگەر ئەمانەش هیچیان ناکەن، ئەبێ تا رۆژی ٢٢ی کانونی دووەمی ١٩٤٧ کەسیان لە ئێران نەمێنن و ئەم وڵاتە بەجێ بێڵن.).

[مەلا مستەفا] لەپاش وەرگرتنی ئەم مەرجانە چاوی بە [قەوامولسەڵتەنە] کەوتەوە و لەپاش دانیشتنێکی باش پێی وت مەرجەکان هەموویان بەجێن و لەچاکەی ئێمەن، ئەمێنێتەوە سەرئەوە کە چەکەکانمان بدەین بە دەستەوە، ئەمەیان تۆزێ ورد بوونەوەی ئەوێ؛ چونکە باوەڕی من، ئەشم وایە هەموو عەشرەتی بەرزانیش ئەوەیان بەلاوە چاک ئەبێ کە ئەو شوێنەدا حوکومەت بۆمان دیاری ئەکا دابنیشین، بەڵام تا ئەگەینە ئەو شوێنە، ئێمە گەلێ عەشایری‌تر هەیە لەسەر رێمانا کە دوژمنمانن، ئەگەر چەکمان پێ نەبێ ناتوانین بەناویانا تێپەڕین. کەوابوو پێویستە ئێمە چەکەکانمان پێ بێ تا ئەگەینە ئەو شوێنە، بۆ ئەوە خۆمانی پێ بپارێزین. کە گەیشتینە جێ ئەو وەختە ئەیدەین بەدەستەوە!.

[قەوامولسەڵتەنە] ئەم قسەیەی پەسەند کرد و رەزمئاراش پشتیوانی قسەکەی کرد، لەسەر ئەم رێککەوتنە بەختیار لەیەک جیابوونەوە و [مەلا مستەفا] و هاوڕێکانی گەڕانەوە بۆ وڵاتی «سندوس» بۆ ئەوە

عەشرەتی [بەرزان] بەرن و بچن لە بناری [تاران] خەریکی کشت‌وکاڵ بن و چەکەکانیان بەبێ هارەق بدەن بە [قەواموڵسەڵتەنە] و حوکومەتی ئێران!!.

لە مەلامستەفا ـم پرسی کە دەنگ وا بلاو ببووەوە گۆیا لەو وەختەدا کە ئێوە چوون بۆ [تاران]، چەند ئەفسەرێکی ئێرانی وەکو بارمتە لەلای [شێخ ئەحمەد]ی براگەورە ماونەتەوە تا ئێوە ئیشتان لەکەوێ بەبارێکدا!.

وتی کەس نەماوەتەوە و کەسمان گل نەداوەتەوە، بەڵکو بەبێ قسە ئێمە چوین بۆ «تاران».

وتم لە ئێرانا کە یەکێکیان بەر چنگ کەوت ئەیگرن و بەرەڵای ناکەن، بەتایبەتی یەکێکی وەکو تۆکە بەو جۆرە بەئاسانی کەوتبوویتە بەردەستیان چۆن نەیانگرتیت؟.

وتی رێک‌وپێکی هێزی [بەرزان] بوو بەهۆی نەگیرانی ئێمە. هەموو کاتێک حوکومەتی [تاران] دەنگ و باسی نەبرو و هێزی بەرزانی وەرئەگرت، بەئەندازەی سەری دەرزیەک بێ هێزیی و سستی لەوانەوە بەرگوێ بکەوتایە خێرا ئێمەی ئەگرت، هەرچەندە لەلایەکەوە بە هەموو جۆر خزمەتیان ئەکردین، لەعەینی وەختیشا بەبێ ئەوە گۆیا ئێمە بزانین دەست‌نیشان کرابووین بۆ ئەوە ئەگەر بێ هێزیەک لەولا هەست بکەن لەملاوە ئێمە بگرن!.

* * *

ئەمە قسەی مەلا بوو کە بۆی گێڕامەوە. لەلایەکی تریشەوە هەندێ لەنووسەرە بەکرێگیراوەکانی ئێرانی شانی خۆیان هەڵئەتەکێنن و ئەڵێن: «حوکومەتی ئێران لەبەرئەوە کەناوی بێ پەیمانی نەیەتەسەر، لەبەرئەوە بوو کە دەستوری گەڕانەوەی [مەلامستەفا]ی دا لەتاران نەیهێشتەوە.» بەشانازیەوە ئەم قسەیە ئەکەن و ئەو تانوتە ئەدەنە پاڵ مەلامستەفا کە گۆیا ئەو پەیمانی خۆی بەڕێوە نەبرد. لەگەڵ ئەوەدا چاو لەوە ئەپۆشن کە هەموو دەمێک کاربەدەستەکانی حوکومەتی ئێران پەیمان شکاندنیان بەلاوە وەکو ئاو خواردنەوە وابووە!.

قسەی دەوری زووتر ناگێڕینەوە، تەنها ئەوە ئەڵێن: کە لەدەوری سەرەتای پادشایەتی «رەزاشا»دا بەچ جۆر سەرۆکە عەشایرەکانی کوردیان لە ولاتەکانی کوردستانی ئێران ئەگرت و ئەیانناردن بۆ «قەسەری قەجەر». بەزمانی شیرینتر لەهەنگوین ئەچوون بەلایانەوە و یەکە یەکە بە سوێند و بەقورئان خواردن راویان ئەکردن و پاشان نە سوێن لەمەیدانا ئەما، نە پەیمان و پەیمان نەشکاندن!. کەچی نووسەرە بەکرێگیراوەکان ئێستە ئەڵێن: بۆیە حوکومەت دەستوری مەلای دا، لەبەرئەوە کە ناو نەبرێ بە پەیمان شکێنەر!. ئای لەم قسەیە چەند زلە؟!. ئەی ئەو سەردەمە کە کوردەکانی بەپەیمان و بەقسەی خۆش بانگ ئەکرد و پاشان ئەیخستنە [قەسری قەجەر]ەوە تا ئەمردن، ئەو وەختە بۆچ پەیمان شکاندن لە کایەدا نەبوو؟!. وا لە باسی «مەلامستەفا»دا پەیمان نەشکاندنیان کرد بەگورزی دەستیان!.

رەنگبێ ئەو نووسەرانە ئەو رێگەیە بۆ کاربەدەستەکانی ئێران پاک بکەنەوە کە بڵێن: «ئەمە سیاسەتە و هەر رۆژێک بە بارێکا هەڵئەسووڕێ. ئەو رۆژە سیاسەت ئەوەی ئەویست، ئەم

ڕۆژەش پەیمان نەشکاندن ئەمەی ئەوێ!».

لەسەر قسەی ئەمجۆرە نووسەرانە ئەبێ ئەو کاربەدەستانەی ئێران وەکو «حوشترمورغ» وابن؛ کە پێی بووترێ وەرە باربەرە، ئەڵێ من باڵدارم، باڵدار چۆن بار ئەبا؟. کە پێی بڵێن کەواتە وەرە «دان» بخۆ، ئەڵێ چاوتان لێ‌نییە من وەکو حوشتر وامە، حوشتر چۆن دان ئەخوا؟!.

ئەوانیش ئەو سەمەرەیە لێی ڕوویداون! کە پێیان بوترێ ئەگەر بەتەنگ پەیمانەوەن بۆچ لەگەڵ کوردەکانی دەوری [ڕەزاشا]دا واتان کرد؟. ئەڵێن ئەوە سیاسەتە و لە سیاسەتا پەیمان شکاندن نییە. ئەگەر بڵێن: ئەی چۆن مەلامستەفا ئیزن درا لە تاران گەڕایەوە ئەو سیاسەتە لەوێدا بۆ لەکارنەبرا؟. ئەڵێن: ئای! پەیمان لەبەینا هەبوو، چۆن بێ پەیمانی ئەکرێ؟!...

لەگەڵ ئەمانەشا کوتەک ئەزانێ قۆناغ لە کوێیە!. گەڕانەوەی [مەلامستەفا] لە تاران لەبەرئەوە نەبوو کە پەیمانیان پێدابوو، بەڵکو لەبەرئەوە بوو کە ئەو ڕۆژەی کوردەواری ئەو وڵاتە لەهەموو لایەکەوە جۆشی ئەخوارد... لەبەرئەوە بوو کە ڕەشید بەگ و نوری بەگی هەرکی لە وڵاتەکانی مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕدا بە دوو هەزار پیاوی پڕچەکەوە ڕاوەستابوون. عەشرەتەکانی «زەرزا» و «مامشی قادری» بەینی «شنۆ» و «ئاراس»یان بە تفەنگ تەنیبوو. شوکاکەکان بە دوو هەزار و پێنجسەد تفەنگەوە لەولاوە لە پارێزابوون. عومەر ئاغای خالید.ئاغای جەلالی بە دوو هەزار تفەنگی پڕفیشەکەوە ئەو وڵاتەی گرتبوو. لەملاشەوە بەرزانییەکان خۆیان بە هەموو جۆرە هێزێکەوە وەکو تیسکەی تفەنگ ڕاوستابوون.

ئەمانەبوون حوکومەتی ئێرانیان ناچار کرد بەوە کە «مەلامستەفا» بگێڕێتەوە بۆ وڵات، نەوەک پەیمان نەشکاندن وەکو نووسەرەکان ئەیڵێن!. ئەوەندە هەیە پیاو کە دەستی دا بەنووسینی کارەسات، یا تەئریخێکەوە زۆر حەیفە ڕاستی و حەقایەقەکان بکا بە ژێر لێوەوە و ئەوەی ڕووکەشە ئەوە بخاتە بەرچاو. ئەگەر ئەو وا بکا، پاشە ڕۆژ ڕاستییەکە دەرئەخا!.

ئەمەو دیسان شتێکی تریش هەیە:

کاربەدەستەکانی ئەو ڕۆژەی ئێران ـ وەکو هی پێشینەکانیان ـ ئەچوون هەندێ لە کوردەکانیان هەڵئەخڕاند و بە هێزی ئەوانەوە ئەچوون بەگژ مەلامستەفا ـ دا و لەڕاستیشدا ئەگەر ئەوانە نەبوونایە، ئەبروی ئێران هەروا بەو ئاسانیە کاری خۆی لەگەڵ مەلادا نەئەبڕیەوە.

تا ئەو ڕۆژە کە ئیشیان بەوجۆرە کوردانە هەبوو، بەوە شانیاز بەرز ئەکردەوە کە ئەمانە «شا دۆستن!» و هەزار و یەک پەیمانیان ئەدانێ!. لەپاشا کە ئیشی حوکومەت لەگەڵ مەلادا یەک لایی بووەوە، نەپەیمان لە کایەدا ماو نەئەو زمان خۆشیە لەناوا ما!.

بە پێچەوانەی ئەوە نووسەرە بەکرێگیراوەکان وەختێ قەڵەمیان ئەخستە سەر کاغەز بۆیان و باسیانیان ئەکرد ئەیانوت: «ئەمانە قازانجێکیان نەبوو، هەر ئەوەندە بوون ـ بەتەعبیری خۆیان ـ سیاهی لەشکربوون!». ئەم چەند وشەیە هەموو خەڵات و بەراتی و پەیمانەکەیان بوو کە پێیان ئەدرا!. نووسەرەکان بەوجۆرە حەقایەق دەرئەبڕن. بەڵام لە لایەکی تریشەوە ئەمجۆرە قسە

کردنانەیان بێ گۆمان گوێی ئەو کوردانە ئەزرینگێنێتەوە کە ئەو رۆژە بۆ «بارەقەاللە»یەکی رووت، دابوویانە پاڵ کاربەدەستەکانی ئێران و لە پاشیشا ئەو پەڵەرەشەیان نووسان بەناو چەوانی خۆیانەوە!. ئەمە تۆڵەی خزمەتکردنی بێگانەیە.

* * *

«مەلامستەفا» کە گەڕایەوە لە تاران و گەیشتەوە ناو بەرزانیەکان، لەپاش قسە و باس بڕیاری شەڕیاندا لەگەڵ ئێرانا، ناوچەی شەڕیان لە «نەغەدە» و «جڵدیان»ەوە گواستەوە بۆ شاری «شنۆ» و شنۆیان کرد بە مەرکەزی قیادە، لەولاشەوە لەگەڵ زیرۆبەگ و تایەرئاغا و رەشیدبەگی مەندیبەگ ـکە ئەمانە لەعەشرەتەکانی شوکاک و هەرکی و سەربە بەرزان بوون ـ دەمیان گەیشتەیەک و بڕیاریان هاتە سەرئەوە کە ئەوان لەقۆڵی «ورمێ»وە و ئەمان لەملاوە وەکو سەنگ راوەستن و ئەگەر «ئێران» پەلاماری‌دان بچن بە گژیا.

ماوەیەکی پێ چوو بەسەر گەڕانەوەی مەلامستەفا دا و هیچ دەنگێکی نەبوو، [قەوامولسەڵتەنە] تێگەیشت کە مەلامستەفا گوڵی خۆی لێوەشاند و تەفرەی دا!. سەرگوزەشتی رێوی و کۆترەکەی کەوتەوە بیر کە ئەڵێ: جارێک رێوییەک کۆترێکی گرت. کۆترەکە وتی ئەگەر جارێکی خۆم نەکەم خوراوم. بە رێوییەکەی وت: «ئەرێ مام رێوی بێ‌قەوی نەبێ، پرسیار هیچی تێدا نییە، لە پێش ئەوەدا نۆشم کەی ئەمەوی لێت بپرسم جەنابت خەڵکی کام وڵاتیت؟.». رێوی دەمی هەڵهێنایەوە وتی «بانە»... هەر کە وتی [بانە] کۆتر لەدەمی هەڵفڕی و دای لەشەقەی باڵ و لێی دا رۆیشت!.

رێوییەکە لەدوو سەرەوە سەیری ئەکرد و جینگڵی ئەدا و ئەیوت «ئاخ! ئەگەر ئەمجارە بەرپەلم کەوتیەوە ئەبێ بڵێم شاربازێرم، شاربازێرم!.». دانیشی بۆی چیر ئەکردەوە!.).

لەمجا حوکومەتی [تاران] بەهۆی [قەواموڵسەڵتەنە] و رەزمئاراوە لە ١١ی شوباتی ١٩٤٧دا فەرمانی دەرکرد کە پەلاماری لەشکرەکانی «بەرزان» و شوکاک و هەرکی لە [ورمێ] و دەشتی «سندوس» و شنۆ بدرێ و چەکیان لێ بسێنرێتەوە و خۆشیان لەناو بەرن.

لەشکرێک لەژێر فەرماندەیی «سەرتیپ زەنگەنە» لەدەوروبەری «ورمێ» وە بۆ دۆڵی «قاسملۆ» بەرێ خرا بۆ سەر زیرۆبەگ و تایەرئاغا بۆ ئەوە نەیەڵن ئەمانە بگەنە بە بەرزانیەکان.

لەشکرێک لەژێر فەرماندەی «سەرهەنگ ئەنساری» لە سابلاخەوە بۆ گرتنی نەغەدە.

لەشکرێک لەژێر فەرماندەیی رەئیس ئەوەل «کلاشی» دا بۆ گرتنی قەڵای «پەسوێ».

لەشکری عەشایری مەنگوڕ و مامەش لەژێر فەرماندەیی «بەهادوری» دا بۆسەر مەلامستەفا و بەرزانیەکان و بۆ دەوروبەری «خانە».

ئەم لەشکرانە بەهەموو هێزێکی هەوایی ـفڕۆکە ـ [تۆپ] و [دەبابە] و مەترەلۆز و جبەخانەی حوکومەتیەوە کەوتنە پەلاماردان ـ لە ٢١ی شوباتی ١٩٤٧ لەشکری سەرتیپ زەنگەنە لە دۆڵی «قاسملۆ» لەگەڵ نەیروی زیرۆبەگ و شوکاکدا کەوتنە شەڕەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە فڕۆکە و تۆپ و

دەبابەی حوکومەت وەکو بارانی بەهار گوللەی ئەباراند، چەند رۆژێک ئەو شەڕە درێژەی کێشا، لەئاخرا رۆژهەلاتی ئەو ناوچەیە لەدەست نەیروی حوکومەت دەرهێنرا و کوشتار و بریندار لەهەر دوولا زۆر بوو.

لەم خەتەوە ئەمە روویدا، بەلام لە خەتەکانی ترەوە سەیری ئەڕ وائەکرا کە لەوانە بێ ئێرانیەکان پێشکەون. بەرزانیەکان لەبەرئەوە بتوانن کەڵک لە ناوچەکانی «مەرگەوڕ» و «تەرگەوڕ» وەرگرن و مەیدانی شەڕیان فرواتر بێ [تەگبیر]یان هاتە سەر ئەوە کە ناوچەکانی «بەسوێ، سۆفیان، جلدیان» بەجێ بێلن و بەتەواوی بنکەی شەڕ ببەنە «شنۆ».

کە ئەمان لەجێبەجێ کردنی ئەم ئیشەدا بوون حوکومەتی [ئێران] کەوتە خۆی و لەشکرێکی پڕچەکی لەژێر فەرماندەیی «سەرهەنگ نسرالله نیساری» لە ١١ی مارتی ١٩٤٧ دا لەورمێوە بۆ لای دۆلی «ئەنهرچایی» بەرێ کرد بۆ ئەوە بتوانن «موان» داگیر کەن و بکەونە بەینی لەشکری عەشرەتی [رەشید بەگ] و [نوری بەگ] و عەشرەتی بەرزانەوە. کە گەیشتن لەگەل لەشکری عەشایری شوکاکاکەوتنە شەڕێکی مردن و ژیانەوە، لەئاخراگەلێ لە شوێنەکانی ئەو ناوەیان داگیر کرد و ئەو ئارەزووە کە هەیانبوو، واتە بەیەک نەگەیشتنی شوکاک و «بەرزان»، بۆیان پێکهات و تەنانەت [نوری بەگ] و [رەشید بەگ] خۆیان دا بەدەستەوە و چوونە «ورمێ»وە.

لەشکری «بەرزان» ئەو شوێنانە کە بەدەستیانەوە بوو لەگەل ئەو هەموو پەلامارەشا کە ئەبرابە سەریان، ئاگاداری شوێنەکانی خۆیانیان ئەکرد و گەلێ جاریش نەیروی ئێرانیان ئەگێڕایە دواوە و گەلێ کوژراو و برینداریشیان لێ ئەخستن.

ئێرانیەکان کە سەیریان کرد تا ئەم شوێنانە بەدەست بەرزانیەکانەوە بێ لەدانی کوژرا و بریندار بەولاوە نەبێ هیچ کەلکێکی تر وەرناگرن، لەبەرئەمە عێلجاریان کرد و بڕیاریان دا کە بەهەر جۆرە بووە پەلامارێکی شێلکانە بدەن و ئیشێکی وا بکەن کە ئەو شوێنانە لەدەست [بەرزان]یەکان دەرێنن.

لە ١٤ی مارتی ١٩٤٧دا لەژێر فەرماندەیی سەرهەنگ ئەنسارێ لە «قەلا چوخ» پەلاماریان بردەسەری «ئەرنە». لە خوارەوە هێزی سەربازی نیزامی و تۆپ و دەبابە و لەسەریشەوە فرۆکە کەوتە کار. لەگەل ئەم هەموانەشا بەرزانییەکان دلێرانە هاتنە دەست و لەهەر دوولاکوشتارێکی زۆر پەیدابوو، لە ئەفسەرەکانی ئێران «سەیید جەلالی رەحیمی» کوژرا و لەئاوایی «ئەرنە»شر ٧ کەس. لەئەنجاما بەرزانییەکان بۆ شوێن قایمکردن فیکریان هاتە سەر ئەوە کە دەست لەلای شیمال هەلبگرن و لەناوشاری «شنۆ» جێگیر ببن و روو بە جنوب پەلامار بدەن کە ئەم نەخشەیەیان دامەزراند و لە (شنۆ) جێگیر بوون، شاری شنۆ کرا بەشوێنێکی هەرە بەکاری جەنگیی، مەلا بەجۆرێکی رەسمی بلاوی کردەوە هەر کەسە بە ئێرانیەکان نزیک بکەوێتەوە بەقسە، یا بەنامە، یا بە خەبەر و باس، تۆلەی خۆی زۆر بە خراپی ئەبینێتەوە.

ئەمجا لە ١٥ی مارتی ١٩٤٧دا پەلاماری «نالس و نەلۆس»ی دا ـ کە لەلایان هێزی ئێرانەوە

ڕەئیس ئەوەل «کلاشی» بەهەموو چەشنە هێزێکی عەسکریەوە لەوێ بوو ـ لە پاش شەڕێکی مەردانە، مەرکەزی «نەلۆس» کەوتە دەست بەرزانیەکان، «کلاشی» سەرکردەی نەیروی ئێران کوژرا، ٩ سەرباز بریندار بوو، ٩٦ کەسیشیان لێ بەدیل گرتن، فیشەک و جبەخانە و خواردەمەنیەکی زۆریشیان هێنایەوە. لەم «٩٦» پێنجیان ئەفسەر بوون.

لە ڕۆژی ١٧ی مارت دا نەیروی [ئێران] لەو ناوەدا بڕیاریان دا کە پشتیوانی لەشکری مەرکەزی «سۆفیان» بکەن و بە هەموویانەوە هێرش بەرنە سەر بەرزانیەکان. ئەم نەخشەیەیان جێبەجێ کرد و پەلاماری خۆیانیان دا. لە ئەنجامی شەڕێکی گەرما، نەیروی ئێران دیسان هیچی پێ نەکرا. سەرکردەی لەشکری پیادە ڕەئیس «ڕەزا قەرەباغی» کوژرا و لە هەر دوولاش کوشتار و بریندار پەیدا بوو. لێرەشا بەرزانییەکان گەلێ چەکی تریان لەگەڵ ١١ دیل ـ دا دەست کەوت و سەرکەوتن.

* * *

کە ئێش گەیشتە ئەم شوێنە و تەماشا کرا نەیروی «بەرزان» ڕۆژبەڕۆژ هەر لەسەر کەوتنایە، سەرۆکی نەیروی ئێرانی ئەو ناوە «سەرتیپ فیوزی» نەخشەی گۆڕی و نەخشەیەکی تری دامەزران؛ نەخشەیەکی وەهاکە بە هەموو هێزێکیانەوە ئابلۆقەی بەرزانییەکان بدەن و شوێنیان پێ تەنگ کەنەوە، هەر هێزێکی هەوایی و تانکی و زرێلی ـیش هەیە هەمووی بخرێتە کار. لەبەرئەمە لە ١٩ی مارتی ١٩٤٧دا فەرمانی بە بەشکردنی ئەم نەیروانە کرد بەمجۆرە:

١- فەوجێک لەژێر فەرماندەیی سەرهەنگ نیساری لە [موان]ەوە بچێت بۆ «نێرگی و ڕەزگا».

٢- فەوجێک لەژێر فەرماندەیی سەرهەنگ پرتەوی بۆ داگیرکردنی «سلێوان» و یاریەدانی سەرهەنگ نیساری.

٣- فەوجێک لەژێر فەرماندەیی سەرهەنگ فولادوەند لە دۆڵی «پەرەندیز»ەوە بۆ داگیرکردنی «ئاخ بلاخ، کەمەرەزەرد، کرکل، قولقولە و بێزون» ـەوە.

٤- فەوجێک لەژێر فەرماندەیی سەرهەنگ مەجیدی لە «نەغەدە»وە بۆ داگیرکردنی «پیرناسر» و کێوی پادار.

٥- فەوجێک لەژێر فەرمانی سەرهەنگ بیگلەری دا بۆ پاراستنی دۆڵی قاسملۆ، نەوەک بەرزانییەکان بچنە ناویەوە.

٦- فەوجێک لەژێر فەرماندەیی «هومایونی»دا بۆ پاراستنی بەینی [ورمێ] و سابلاخ و بۆ نەبچڕانی خەتی ئەو دوو شوێنە لە یەک و بۆ پشتیوانیکردنی نەیروی «قاسملۆ»یش.

٧- فەوجێک لەژێر فەرماندەیی «سەرهەنگ ئەنساری» دا لە «سۆفیان»ەوە بۆ داگیرکردنی «نەلۆس» و دەوروبەری نەلۆس. ئەمانە بێجگە لە دەستەی عەشایری [مەنگوڕ و مامەش] کە لەژێر فەرماندەیی «بەهادوری»دا بوون.

لەم سەردەمانەدا کە ئەمان ئەمجۆرە نەخشانەیان کێشا، [عەلی حیجازی]یش لەلایەن

حوکومەتی عێراقەوە لە قوڵی «زینۆی شێخی» و «حاجی هۆمەران»ەوە بە هێزێکی تەواوەوە راوستابوو بۆ ئەوە ئەگەر [مەلامستەفا] و هێزی [بەرزان] بگەڕێنەوە بۆ دیوی «عێراق»، ئەمیش لێرەوە سەری ڕێیان پێ بگرێت!.

هەر بۆ ئەم کارقایمیە عەبدولئیلاه و نوری سەعید لە ٢٢ی مارتی ١٩٤٧دا خۆیان گەیاندە «حاجی هۆمەران» و ئەوی پێویست بوو لەم رووەوە رێگەیان بۆ «عەلی حیجازی» دانا.

ئەمە و دیسان بە قسەی راپۆری ئێرانیەکان، حوکومەتی عێراق لەو سەردەمانەدا هەموو مانگێ ٣ هەزار دیناری عێراقی تەرخان کردبوو بۆ «شێخ رەشید»ی بەر دۆست کە ئەویش بە هێزی عەشایری ئەو ناوە و مریدانی خۆیەوە، هەمور دەمێ ئامادەیی بەگژا چوونی مەلامستەفا بێ.

لە ٢٤ی مارتی ١٩٤٧دا کە لە قوڵی ئێرانەوە شەڕ لە جۆشی گەرمی دا بوو، «فەیزوڵلا هومایونی» سەرلەشکری نەیروی ئێران لە «حاجی هۆمەران» لەگەڵ «عەلی حیجازی» چاویان بە یەک کەوت. عەلی حیجازی بڕیاری دایە کە دوو فەوجی سەربازی عێراقی ـکە لە بافستیان و مێرگەسوور ـن، بە هەموو چەکێکیانەوە لەگەڵ ١٢ فرۆکەدا لە ماوەی ٢٤ سەعات بیانهێنێتە قوڵی «حاجی هۆمەران» و بەربەستی مەلا ـیان پێ بکا.

لەخەتی عێراقەوە ئەمە کرا، ئەمجا لە خەتی سنووری تورکیاشەوە لە دەربەندی «بنارد» بە هۆی حوکومەتی [تورکیا]وە ئەویش قایمکرا، ئەمەش بۆ ئەوە کە نەوەک مەلا لەو خەتەوە بچێتە خاکی تورکیا. ٣ فەوجی تورکی، ئەو ناوەی تەنیەوە؛ یەکێک لە کێوەکانی «دالأنپراغ»، یەکێ لە دەربەندی بنارد، یەکێکیش لە بەرانبەر «نێرگی و رەزگا»وە کە، لەملاوە فەوجی سەرهەنگ نیساری ـیشی لێ بوو.

ئەم تەرتیباتانە هەموو بۆ ئەوە کران کە ناوچەی دەسەلاتی هێزی «مەلامستەفا» بە تەوی تەنگ بکەنەوە و بە هەر جۆر بووە بتوانێ بە زیندوویەتی یان بە مردوویەتی بیخەنەگیر.

بەمجۆرە ئەم نەخشانە کێشرا و لە عەینی رۆژی ١٩ دا نەیروکانی نیساری و پرتەوی کەوتنە ئەنجامدانی فەرمانی خۆیان و شەڕێکی قورس لەگەڵ بەرزانیەکانا دەستی پێکرد و لە «سلێوان» گەیشتنە یەک و بۆلای «نێرگی و رەزگا» بەرێ کەوتن. لێرەدا لەشکری [بەرزانی] گیانبازیەکی مەردانەیان نواند و گەلێ کوشتار و بریندار لە دەستەی‌نەیروی ئێران کەوت. لە بەرزانیەکان ٦ کوژراو و ١٢ بریندار روویدا. شەڕی ئەم خەتە تا ٢٥ی مارت درێژەی کێشا.

لە ٢٦ی مارتی ١٩٤٧دا شەڕی «خلج و ئۆرست» دەستی پێکرد، لەم شەڕەدا ئێرانیەکان، بە جەرگێکی قایمتر لە پۆلاوە هاتنە مەیدانەوە. دەستەی پێشمەرگە بەبێ ئەوە کۆ لە مردن بکەنەوە پەلاماری خلج و ئۆرست – یان دا، نەیروەکانی تریش لە پشتیانەوە بەگیاد، و دڵ پشتیوانیان ئەکردن، لە سەرەوە فرۆکە بۆ بۆمباهاویشتن لە واشە و هەڵۆ تیژتر بووا. دەبابەو زرێلی و تۆپی کێوهەڵکەنی کێوی بۆ پێشکەوتن و گولله هاویشتن، هەناسە لە شوێن هەناسە لە کارا بوون. دەستەی هەردوولا بۆ شکانی یەکتر لە شێری برسی، برسی تر بوون. لە ئەنجامی ئەم شەڕەدا

تاکی تەرازوی «بەرزان» قورس تر بوو، لە نەیروی ئێرانی دوو ئەفسەر «سەید محەمەدی ئیمامی» و «هاتفی» لەگەڵ سەربازێکی بێ شومارا لە «ئۆرست» کوژران. ئەفسەر [جەهان پاک] و ۱۵ سەربازیش بە دیل کەوتنە دەست بەرزانییەکان لەگەڵ گەلێ جبەخانە و خواردەمەنییکی زۆردا، سێ فڕۆکەشیان لە کار خست. لە لەشکری بەرزانیش ۳ کوژراو و چەند برینداڕێک روویدا.

لەم کاتەدا فەوجی سەرهەنگ مەجیدی ـ ش گەیشت، ئەویش بە تۆپ و زرێلی جەنگیی و بەشە فڕۆکەی خۆیەوە دایە پاڵ ئەو نەیروی ئێرانە، کە لە شەڕا بوون مەبەستی ئەمان ئەوە بوو کە ئیشێکی وا بکن «پیرناسر» و کێوی «پیردار» لە دەست بەرزانییەکان بسێنن؛ بەرزانییەکان لەشکرەکەی پێشوو شەکەتی کردبوون، کە ئەمانەش هاتن دایانە پاڵیان لە وانە بوو بشکێن، بەڵام مەردانە خۆیان کۆ کردەوە، هەرچەندە کێوی پیردار ـ یان دا بەدەستەوە بەڵام بە جۆرێک کە کاروباریان تێک نە چێ، لەسەنگەرێکی ترا بە هێمنی خۆیان دامەزراندەوە، لەم شەڕەشدا ئەفسەر «رەئوفی» لەنەیروی ئێران لەگەڵ ۱۸ سەربازدا بریندار بوون و کوژراویش گەیشتە ۲۵. لە بەرزان ٦ کوژراو و ۱۱ بریندار روویدا.

بەڵێ کێوی پیردار ـ یاندا بەدەستەوە. ئەوەندە هەبوو ئایا چۆن درا بەدەستەوە؟. ئەمەلەسەر شایەتی دوژمن کە بۆیان ئەدا:

هێزی ئەو شوێنەی ئێرانی هەموی رووی کردبووە «پیردار»، تەماشائەکەن وەکو باران، گوللەیان بەسەرا دێتە خوارەوە، ئەمانیش لەهەر چوار لای کێوەکەوە بینیان پێوە ناوە بۆ پێشکەوتن و هیچ کۆ لەو گوللانە ناکەنەوە. بە تایبەتی [دەبابە] و رزێلییەک سنگ ئەنێن بۆ پێشەوە و هەر ئەڕۆن، لەولاشەوە گوللە باران هەر هەیە.

لەم شوێنەدا بەرزانییەکان بۆ ئەوە سەنگەرەکەی تر قایمکەنەوە، کشابوونەوە بۆ ئەولا، تەنها تاقە بەرزانییەک مابووەوە لە سەنگەرەکەدا و ئەو تاقە کەسە بوو کە ئەو هێرشەی ئەبردە سەر ئەو هەموو هێزەی ئێران. ئەو تاقە بەرزانییە شوێنەکەی خۆی نەدا بەدەستەوە و لە شەڕکردن نەکەوت تا دەبابەکە چوو بەسەریا و بە رەورەوەی دەبابەکە شەهید بوو.

شوێنی دووسەد گوللەی ئەم تاقە بەرزانیە بەدەبابەکەوە بوو، هەر دوو چراکانی ورد کردبوو، گوللە هاوێژی زرێلییەکەی کون کون کردبوو، تۆپێک لەگەڵ ئەو هێزە دابوو، گوللەی ئەم تاقە «بەرزانی»یە بەدرێژایی دابووی لە ناوەڕاستی لوولە تۆپەکە و، تۆپەکەی لەکار خستبوو!.

ئەمەبوو گیانبەختکردنی «بەرزانی» لەشەڕی ئێرانا، خۆیشی نەدا بەدەستەوە تا ئاخر تنۆکی خوێنی لەرێگەی قەومیەتی خۆیا لەژێر رەورەوەی «دەبابە»ی دوژمنا بەخت کرد.

رۆژی ۲۹ی مارت فەوجی سەرهەنگ فولادوەند کە بۆ [پەرەندێز] دانرابوو بە رێ کەوتن و گەیشتنە دەورویەری «ئاخ‌بلاخ». لەرۆژی ۳۰دا کەوتە شەڕەوە، بەرزانییەکان دلێرانە بەرەنگاریان بوون و بۆ پاراستنی شوێن و جێگای خۆیان کۆششیان ئەکرد. لەوانەبوو کە نەیروی [ئێران]

بشکێت، لەو کاتەدا فەرماندرا بەهێزی هەوایی بەتانکی و زرێلی جەنگیی، کە ئەوانیش بکەونەوە ئیشەوە، گوللە تۆپ و مەترەلۆز و بۆمبا وەکو بارانی بەهار هەموو شیو و دۆڵ و کەلاوەکانی دا گرت، بەهۆی ئەم هەموو هێزە ئاگرینانەوە توانیان لەپاش زیانێکی زۆر ئەو شوێنانە لەدەست بەرزانییەکان وەربگرن و، بەرزانییەکان بۆ ئەوە کوشتاری کەمتر بدەن بەدەستەوە شوێنەکانیان بەجێهێشت و گەڕانەوە دواوە. لەم شەڕەدا لە نەیروی ئێران ئەفسەرێک ـ تاج فەڕ ـ و دوو سەرباز بریندابوون و ١٦ سەربازیش کوژران. لەبەرزان ٨ کوژرا و ١٢ بریندار بوو.

کە بەرزانییەکان پشتاوپشت گەڕانەوە و نەیروی ئێران «قوڵنوڵە» و «کەمەرەزەرد» و ئەو ناوانەیان داگیرکرد، بەبێ پشوو فەوجی سەرهەنگ ئەنساری و سەرهەنگ غەفاری ـ یش دایانە پاڵ ئەو نەیروانە و فڕۆکە و زرێلی و تۆپی هەموولایەکیشیان بەجارێ بوون بەیەک و لە ٢٥ی نیسان دا بە کۆمەڵ، هێرشیان هێنایە سەر بەرزانییەکان، ئەم لەشکرە زۆرە لەژێر سێبەری ئەو هەموو هێزە ئاسمانییەدا هەنگاو بە هەنگاو پێش ئەکەوتن. بەرزانییە نەبەزەکان لەگەڵ ئەم هەموو هێزی دوژمنەدا، لەگەڵ ئەوەشدا کە ناوچەی شەڕی ـ شیان تەنگ کرابووەوە، هەر مەردانە و دلێرانە سنگی خۆیانیان ئەنا بە گوللەوە و لەشوێنی خۆیانا ئەچەقین.

کە لەولایەوە بۆمبا بارانی فڕۆکە و لەلایەکەوە هاژەی گوللەی تۆپ و پێشکەوتنی زرێلی و دەبابە زیاتر هێزی ئەسەند، ئەمان ناچار بوون بەوە کە «نەلۆس» و «سنگیان» بەجێ بێڵین و خۆیان بگەیەننە «گەلاس» و ئەو ناوە بەتەواوی چۆڵ بکەن.

لەولاشەوە هێزی عەشایری مەنگوڕ و مامەش ـ کە لەژێر فەرماندەیی بەهادوری ـ دا بوون ـ لەگەڵ عەینی فەوجی بەهادوری دا لە گوندەکانی «تازراس و ناناس» هێرشیان بردەسەر لەشکری دیموکرات ـ کە لەژێر فەرماندەیی زیرۆبەگ و تایەرئاغا بوون ـ لەو هێرشەی ئەوانیشا کێوەکانی «دۆڵێ» لەدەست بەرزانییەکان دەرچوو، لەشکرەکەی «زیرۆبەگ» و «تایرئاغا» روو بە «سێ ئاوان» گەڕانەوە بۆ دواوە و لە «گەلاس» لەگەڵ بەرزانییەکان یەکیان گرتەوە.

دەورەی شەڕ لەدەوری بەرزانییەکان هەر تەنگتر ئەبووەوە، رۆژبە رۆژ نەیروەکانی [ئێران] زیاتر یەکیان ئەگرتەوە، ئەم یەک گرتنەی ئەوان ئەبوو بەزیادە هێزێک بۆیان و ئەبوو بەمایەی بچوک کردنەوەی مەیدانی شەڕی ئەمان. فڕۆکە و تۆپ و دەبابە و زرێلیەکان بە هەموو سوپاکانیانەوە هێرشیان هێنایە سەر «شنۆ» ـ کە مەرکەزی جەنگ و فەرماندەی بەرزانییەکان بوو ـ هێزی حوکومەت لەلایەک و هێزی مەنگوڕ و مامەش لەلایەک. [بەرزان]ی دلێر بە بێ ترس چەند رۆژێک لەژێر ئەم ئاگرباران و گوللە و بۆمبا بارانەدا خۆی راگرت و شێرانە جەنگای کرد. سەرباری ئەمانەش «موساخانی زەرزا» بە خۆی و سوارەکانیەوە هەر لەناو ئارەکەدا بەرەنگاریان بوو.

لەئاخرا لەبەرئەوە کە مەیدانی شەڕەکەیان هەتا ئەهات هەر تەنگتر ئەبووەوە، بۆ ئەوەش نەکەونە داوەوە و پشتیشیان لێ نەگیرێ، لە ٦ی نیسانی ١٩٤٧دا شاری «شنۆ»یان چۆڵ کرد و کەوتنە پشتی «شنۆ» و روو بە رووی خاکی عێراق گەڕانەوە. نەیروە هەوایی و ئاسینەکانی ئێران بە

گوللەی تۆپ و بۆمبا ڕەوانەیان ئەکردن. لەگەڵ ئەم هەموو هێرشانەشدا کە ئەکرایە سەریان گەڕانەوەیان لەسەنگەرەکانیان بەو ڕێکوپێکیە، سەردارە جەنگیەکانی ئێرانی سەرسام کردبوو.

فرۆکە بەبێ ڕەحمانە بۆمبابارانی ژن و منالی بەرزانییەکانی ئەکرد، لەگەڵ ئەمەشدا ئەو دیلانەی ئێرانییەکان کە کەوتبوونە لای بەرزانییەکان بەرانبەر بە بۆمبا بارانەکەی ئەوان، ئەمان بە مەردانە خزمەتیان ئەکردن.

لەپاش ئەوە کە لە دۆڵی «گەلاس» دەرچوون، بۆ ئەوە تۆزێ ئەرکی گەڕان و هەڵسووڕانیان کەمتر بێتەوە ئەوەندە بەتەنگ ئەوەوە نەمان کە ئەگاداری دیلەکان بکەن. وەکو بڵێیت بەزمانی حاڵ پێیان ئەوتن کە بڕۆن. دیلەکان ئەم شڵەژانەی ئەمانیان بە هەل زانی، هەڵاتن و گەڕانەوە بۆ ناوچەی ئێرانییەکان.

بەرزانی دلێر بەمجۆرە لەشەڕی مردن و ژیانا بوو وردەوردە بە جۆرێکی ڕێکوپێک لەپردی «قادر» و ناوچەی «تاڵجار» وکێوەکانی «گلە شین» و «مەرگ زیارەت»»وە بەرە و پاش ئەگەڕایەوە، تا لە ڕۆژی ١٧ و ١٨ی نیسانی ١٩٤٧دا هاتەوە ناو خاکی عێراق، هاتەوە لەژێر بارانی گوللەی تۆپ و مەترەلۆز و لەژێر بۆمبای فڕۆکەدا.

لە ئەنجامی ئەم شەڕەی بەرزانی و ئێرانیەکانا ٥ قائید و ٤٠ ئەفسەر و ٢٠٥ کوژرا و لە ئێرانییەکان پەیدا بوو لەگەڵ ٣٠٠ بریندارا. لەو کوردانەی کە لەگەڵ ئێرانیەکانا شەڕیان لەگەڵ بەرزانییەکان ئەکرد، لەوانیش ٣٤ کوژراو و ٥٣ بریندار ڕوویدا.

لەدەستەی بەرزانی ـ ش لەهەموو شەڕەکانا ١٢٠ شەهید و ٢٥٠ بریندار ڕوویدا.

* * *

[مەلامستەفا بەرزانی] و هەموو دەستەی بەرزانیەکان بەمجۆرە ڕوویان کردەوە خاکی عێراق و گەڕانەوە، بەڵام ئایا ئەوانەی کە تەئریخ ئەخوێننەوە، یا ئەوانەێ کەوا کاروباری سیاسەت و شەڕ و شۆڕ هەڵئەسووڕێنن بەچ چاوێکەوەوە یا باوەڕێکەوە سەیری ئەم گەڕانەوەیە و سەیری ئەم پەردانە ئەکەن؟.

ئایا بەو چاوەوە سەیری ئەکەن کە ئەڵێن لەشکرێک بوو شەڕی کرد و شکا و گەڕایەوە؟. یا ئەڵێن لەشکرێک بوو تا ئاخر هەناسە جەنگی کرد و پاشان بەسەرکەوتوویی گەڕایەوە؟.

بێگومان هەموو کەسێک و هەموو جەنگاوەرێک ئەم باوەڕەی دووەم وەرئەگرێ؛ چونکە هەموو پیاوە گەورەکانی مەیدانی سیاسەت و شەڕ، لە کاتێکا کە بیانەوێ شانازی بە لەشکرەکەی خۆیانەوە بکەن ئەڵێن لەفلانە خەتی جەنگ بە جۆرێکی ڕێکوپێک گەڕاینەوە. وەکو هەموو جار «چەرچڵ» لەناوەندی ئەم شەڕی دووەمەدا شانازی بەوەوە ئەکردکە ئەبوت نەبروەکەی ئێمە لەفلانە شوێن بە جۆرێکی ڕێکوپێک گەڕایەوە دواوە.

ئەم قسەیە و ئەم ڕێگەیە زۆری تیایە؛ مەعنای وایە دوژمن زۆر زاڵ بووە، لەگەڵ ئەو زاڵیەشدا دەستەی ئەم، ئەو دەرفەتەیان نەداونەتێ کە بیانگرن، یا شتومەکیان بەتالان بەرن. ئەمجۆرە شتانە

بۆ مەیدانی شەڕ و شۆڕ بەگەورەتر سەرکەوتن دائەنرێ.

لەشکری [بەرزان] لەگەڵ ئەوەدا کە دوژمن لەهەموو کاتێکا دە ئەوەندەی ئەمان بوون و هەر جۆرە چەکێکی تازە لە فڕۆکە، لە زرێپۆش، لە تۆپ، لە دەبابە بەدەسەلاتێکی حوکومەتی و بەجۆرێکی بێ شومار لە لایان بوون، لەگەڵ ئەمانەشا [بەرزان] توانی بەرانبەریی ئەو هێزە بێ ئەندازەیە بکا و لەگەڵێ وەختا و لەگەڵێ شوێنا دیلیان لێبگرێ و تالانیان لێ بسێنێ، جەنگاوەریەکەیشی بگاتە پایەیەک کە دیلێکی لێنەگیرێ، لەگەڵ ئەو هەموو منال و خێزانەدا کە لەگەڵیان بووە منالێک نەدا بەدەستەوە، یا تفەنگێک نەدۆڕێنێ، بەهەموو ئازاییەک و نەبەزییەکەوە بەرانبەریی ئەولێشاوە حوکومەتیە بکات و چۆن رۆیشتوە بەوجۆرە بگاتەوە ولاتی خۆی!.

بێگومان ئەمە لەمەیدانی شەڕ و سیاسەتا بەگەورەتر سەرکەوتن دائەنرێ و سەرۆکی ئەم لەشکرە کە ئەم نەخشانە دائەڕێژێ، بە یەکێ لە بلیمەتە هەرە گەورەکانی پیاوی جەنگیی دائەنرێ.

* * *

وەزارتی «سالح جەبر» بوو لە عێراقا، دوو دانە لە کوردەکان ـ توفیق وەهبی و جەمال بابان ـ بەناوی وەزیری کوردەوە وەزیری مەعارف و عەدلیەبوون. مەلامستەفا کە بەوجۆرە حوکومەتی ئێران لەهەمولایەکەوە پەلاماری دا، ئەوە بوو لە ١٧ و ١٨ی نیساری ١٩٤٧دا خۆی و هەموو بەرزانیەکان هاتنەوە ناو ولاتی عێراق و ئێرانیان بەجێهێشت. ئەمانەش کە هاتنەوە عیبارەت بوون لە ٤٥٦٥کەس؛ ١٥٥٠ پیاو، ١٦٨٦ ئافرەت، ١٣٢٩ منال.

حوکومەتی عێراقی ئەو سوپا و سەنگەرانەکە تا دەچوونی [مەلامستەفا] لە جۆری یەکەمدا لە عێراقدا لەو ولاتە هەیبوو، لەماوەی نەمانی ئەما سەرنگەر و نوختە و قوشەنی زیاتر کردبوو، چونکە هەموو رۆژێک ترسی گەڕانەوەی «مەلامستەفا»ی هەر هەبوو!. کە مەلا گەڕایەوە، گەڕایەوە بەسەر شوێنێکا کە هەموو سوچێکی بەهەموو جۆرە چەکێکی حوکومەت قایمکراوە، لە «رەواندز»ەوە تا ئەچێتە «زاخۆ» هیچ شوێنێک نەماوەتەوە کە خالی بێ لە هێزی حوکومەت و لەو کوردانە کە نایانەوی «مەلامستەفا» لەو ولاتەدا بژی.

مەلا سەیری کرد روو بکاتە هەر لایەک، لەبارانی گوللەی بێ ئامان بەولاوە هیچی تر پێشوازی ئەم زن و مندالانە ناکا کە لەگەڵین. بەناچاری کەوتە قسەکردن لەگەڵ حوکومەتی [سالح جەبر]دا بۆ ئەوە حوکومەت لێیان خۆشبێ و ئەمانیش بتوانن وەکو هەموو نیشتمانییەک لەولاتەکەی خۆیانا دانیشن. حوکومەت ئەم قسانەی نەچوو بەگوێچکەدا و هەر لەسەر ئەو قسەیە بوو کە بەبێ هیچ قسەیەک و هیچ مەرجێک ئەبێ خۆیان بدەن بە دەستەوە!.

کەئیش گەیشتە ئەم شوێنە، مەلامستەفا و [شێخ ئەحمەدی براگەورە] و سەرۆکەکانی [بەرزانی] و زابتەکان بوون بەدوو دەستەوە؛ دەستەیەکیان وتیان وەکو حوکومەت ئەیلێ بەوجۆرە خومان بدەین بەدەستەوە. مەلا ـ ش لەسەر ئەو قسەیە بوو کە بەمجۆرە نابێ، لەئاخرا [شێخ ئەحمەدی براگەورە] و هەندێک لەزابتەکان بڕیاریان داکە خۆیان بدەن بەدەستەوە. مەلامستەفا و

«میرحاج» و چەند زابتێکی تریش هەر لەسەر قسەی خۆیان مانەوە کە مادام ئەمان چەکیان هەیە خۆیان نادەن بەدەستەوە؛ ژن و مناڵ با خۆی بدا بەدەستەوە.

لەسەر ئەمە «شێخ ئەحمەد» و «عیزەت عەزیز» و چەند زابتێکی تر لە ١٩٤٧/٥/٦ دا ژن و منالّ و ئەوانەش کە ئارەزوویان لێ بوو، ئەو سەردەمە «عەلی حیجازی»ش لەو دەورە بوو، خۆیان چەکیان دا بەدەست ئەوەوە لەسەر ئەو ئیعتیبارە کە حوکومەت لێیان خۆشبێ، [مەلامستەفا] و ئەوانەش کە گەڵی مانەوە لەپیاوی تفەنگچی و رەبەن، لەشوێنەکەی خۆیان مانەوە و خۆیان نەدا بەدەستەوە و هەر کەوتنە مخابەرە و قسەکردن لەگەڵ حوکومەتا کەلێیان خۆشبێ.

کە [شێخ ئەحمەد] و ئەوان خۆیان دا بەدەستەوە، حوکومەت لەباتی ئەوە میهرەبانییان لەگەڵ بنوێنێ، هێنای هەموویانی تەفروتونای ولاّتەکانی [بەسرە]، [ناسریە]، [حیلە و کەربەلا] کرد و بەبێ دەرەتانی لەو ناوەدا بلاّوی کردنەوە و لەگۆشەی چەپسخانەکانا ژاراوی مەرگیان ئەچێشت!. ئەوانەشیان کە ژن و منالّ بوون، لەولاّتەکانی هەولێر و بیتوێن بە ناهۆمێدی مانەوە. سەرەڕای ئەمەش لە ١٩٤٩ دا دیسان فەرمانێکی تر دەرکرایەوە کە ئەم ژن و منداڵانە ئەوەندەی تر لەو شوێنانە دوورر بخرێنەوە.

بەڵێ لەپاش ئەوە کە ئەمانە خۆیان دا بەدەستەوە، حوکومەت لە میزانیەی ساڵی ١٩٤٧ ١٠٠ هەزار دیناری دانا کە بدرێ بە خواردن و جل و بەرگ بۆ ئەم ژن و منالّ کەساسە دەربەدەرانە. «بەهائەدین نوری» و «عیزەدین مەلا» سەروکاری دا بەشکردنی ئەم پارەیەیان ئەکرد بە سەریانا ـ ئەم دوو کەسەش نائیبی کورد بوون ـ لە بەخێوکردنی ژن و منالّی بەرزانیەکان لەم پارەیە ئەوە بوو کە هەر لەو ساڵەدا یەکێک لەو کەسانە کە نانی بەرزانیەکانی چاو پێکەوت، نووسەری ئەم کتێبە بوو؛ لە هەولێر ئەو نانەیان پیشان دام کە ئەیاندا بە بەرزانی، نانەکەش عیبارەت بوو لەگەچ و لەئارد کە تێکەڵاو کرابوون.

ئەمان بەمجۆرە بەکەساسی کەوتنە گۆشەی حەپسخانە و ولاّتەکانەوە، [مەلامستەفا] و [میرحاج] و هاورێکانیشی لەولاوە هەر داوای لێخۆشبوون و لێبوردنیان ئەکرد. حوکومەت و پیاوانی حوکومەت لەباتی ئەوە لێیان خۆشبن و ئەمن و ئاسایش بخەنە ولاّتەوە، هێنایان لە ٦ی مایسی ١٩٤٧دا سەرلەنوێ ـ ئیعلانی ئەحکامی عورفی ـ یان لەولاّتەکانی «رەواندز» و «زێبار» و ئەو ناوەدا دانایەوە و عەبدولئیلاە مۆری کردا. بەدانانی ئەم عورفیە ئەوەندەی تر ترسیان خستە بەر ئەو ولاّتە و ئەوەندەی تر «مەلامستەفا»یان لە خۆیان دوورر خستەوە.

رۆژی ٥ی حوزەیرانی ١٩٤٧ بوو، لەبەغدادا هەندێک لەپیاوە کوردەکانی بەغدا و نائیبەکان و قوتابی دانشگاکان کۆبوونەوە بەو نیازە کە بچن بۆلای [عەبدولئیلاە] تکای لێ بکەن بۆ ئەوە لەبەرزانییەکان و ئەفسەرەکان خۆشبێ. قسەیان هاتە سەرئەوە کە من بچم بۆلای یەکێ لە دوو وەزیرە کوردەکان ـ کە لەوەزارەتا بوون ـ بۆ ئەوە ئەویش بەو ناوەوە کە وەزیرێکی کوردە لەگەڵ خەڵکەکە دا بێت و بچن بۆلای عەبدولئیلاە. کە چووم جوابێکی ئەوەندە ناپەسەندی دامەوە؛

مەگەر هەر ئەو بزانێ جوابی وا جوان لە ناپەسەندیدا بداتەوە! ١ [تەئریخ] ئەو پرسیار و وەڵامە بپلێتەوە بۆ «یادداشت»ەکەم، ئەگەر چاپکرا ئەو وەختە ئەیخوێنیەوە!.

هەندێک لەو ئەفسەرانە کە وەختی خۆی لەگەڵ مەلامستەفا ـ دا رونشتبورن: «رەئیس ئەوەڵ روکن عیزەت عەبدولعەزیز، رەئیس ئەوەڵ مستەفا خۆشناو، رەئیس خەیروڵلا عەبدولکەریم، ملازم محەمەد مەحمود قودسی» بورن. وەختی خۆی ئەمانە بەبێ ئەوە خۆیان بە رووەوە بن، ئەحکامی عورفی ساڵانی ١٩٤٥ حوکمی خنکاندنی دابوو بەسەریانا. کە [شێخ ئەحمەد] خۆی دا بەدەستەوە، ئەمانەش بەو نیازە کە لێیان ببورن لەگەڵ ئەوا خۆیان دا بەدەستەوە. کە کەوتنە گیر، سەرلەنوێ لە ـ مەحکەمەی عورفی ـ ئەمساڵەدا بە جۆرێکی لاە سەرلایی مرحاکەمە کرانەوە و بڕیاری حوکمی خنکاندنەکەیان درایەوە.

لەگەڵ ئەوەشا کەگەلێ کەس کۆششی کرد بۆ نەخنکاندنی ئەمانە، لە بەرەبەیانی پێنجشەمەی ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧ لە بەندیخانەی بەغدا هەر چواریان خنکێنران و بوون بە قوچی قوربانی چڵێسی عەبدولئیلاە و پیاوانی عەبدولئیلاە. پاشان تەرمەکانیان برانەوە بۆ: سولەیمانی، هەولێر و ئامێدی، شەعبی دڵ بریندار قوری گۆڕەکانیانی بەلافاوی فرمێسکی چاویان گرتەوە و ناشتنیان، دووکەڵی کزەی دڵی ئەو شەعبە ئێستەش لەسەر گۆڕەکانیان سێبەری کردوو، بۆ ئەوە بزانن کە هەر لە دڵی میللەتان و قەت دەرناچن.

ئەمەش وێنەی ئەو نامە و وەسیەتنامەیەیە کە بە ١٤ سەعات پێش خنکاندنیان بەدەستنووسی [محەمەد مەحمود] نووسیویانە و داویانە بەمیللەتی کورد؛ داویانێ بەدیاری لە شوێنی لەشەکەی خۆیان:

دقی وێنەی نامەی چوار ئەفسەرە شەهیدەکە:

بەغداد

١٨/حوزەیران/١٩٤٧

لە: شەهیدای رێگای نیشتمانەوە

لە: عیزەت عەبدولعەزیز و مستەفا خۆشناو و خەیروڵلا عەبدولکەریم و محەمەد مەحمود ـەوە

بۆ:

برایانی میللەتی کوردی خۆشەویست

لە دوای تەبلیغی حوکمی ئیعدام بە یەک سەعات نووسراوە

برایان: لە ژیانی ژێردەستی و ئیستیعماردا لە نووسینی ئەم نامەیەوە تەنها ١٤سەعاتمان ماوە بە پەتی ئیستیعمار دەگەینە دنیای ئازادی و گیانمان دەگاتە گیانی پاکی شەهیدای رێگای نیشتمان.

برایان:

خۆمان زۆر بە بەختیلر دەزانین کە بەرامبەر واجبی میللی هیچ دوا نەکەوتین تەنها نەسیحەتی ئێمە ئەوەیە کە لاوان و نیشتمانپەروەرانی کورد نیکرانی زات بکەنە نیشانە و یەکیەتی بکەنە پەیڕەوی خۆیان بۆ شکاندنی تەوقی ئیستیعماز و رزگارکردنی هەموو میللەتێکی مەزلووم بێ جیاوازی.

برایان:

دوژمنی جەهالەت بن بەهەموو تواناتان شەڕی جەهالەت بکەن وە دوای جەهالەت مەکەون. ئێمە نیشانەی تێکوشینی میللی میللەتی کوردین لە ساڵی ١٩٤٧دا. برایانی ئێمە کە ماون بۆ ڕێگای شەرەف تێدەکۆشن وە پشت بە خودای گەورە میللەت رزگاری دەبێ.

برایان:

هاتنمانە بەر سێدارە لە بێ دەسەڵاتیەوە و سێ و دوو کردنەوە نەبوو بۆ تێکۆشین، بەڵکو هەر وەکو سەربازێکی ئازاد تا ئاخرین توانا هەوڵمان داو و گەیشتینە ئەم نەتیجەیە. ئیدی بۆ یەکیەتی وە بۆ ئازادی. بژی کورد و کوردستان.

خەیروڵلا عەبدولکەریم مستەفا خوشناو عیزەت عەبدولعەزیز مەحمەد مەحمود

• • •

بەمجۆرە ئەم وەسیەتنامەیەیان نووسی بۆ گەلەکەیان و پاش ١٤ سەعات، کە برانە بەر «قەنارە»کەش لەو وەختەدا پەتەکەیان ئەکردە ملی خۆیانەوە هەر یەکە بە وتەیەکی تەئریخی ماڵاوابیان لەحالەمی کورد ئەکرد.

سەرەتاکە [عیزەت عەبدولعەزیز] هێنرا وتی:

«دوا ئامۆژکاریم ئەمەیە بۆ گەلەکەم ئەم ڕێگایەی من گرتوومە ئەوانیش بیگرن، مردن لەپێناوی کامەرانی گەل، بەرزترین سەربەرزییە بۆ ئادەمیزاد.»

کە [مستەفا خۆشناو] هێنرا وتی:

«داری ئازادی گەلان بەخوێن ئاو ئەدرێت. باخوێنی منیش دڵۆپێک بێت لەو خوێنە بۆ ئازادی عێراق و گەلی کورد. بژی کورد و کوردستان بە ئازادی و سەربەستی.»

کە [خەیروڵلا] هێنرا وتی:

«ئیستیعمار و نوکەرانی ئیستیعمار! ئەتوانن من و سەدهای وەک من بکوژن، بەڵام ناتوانن ١٢ ملیۆن کورد و ملیۆنەها ئازادی خواز لە جیهانا لەناو بەرن.»

کە [محەمەد قودسی] هێنرا ئاخر هەناسەی لەسەر ئەم قسەیە بڕایەوە:

«مردن لەرێگای وڵات خۆشترین شتە ئادەمیزاد دەستی بکەوێ، ئێمەش لەرۆژی لەدایک بوونمانەوە هەر بە ئاواتی ئەمەبووین کە لە رێگای ئازادی کورد و کوردستان و کامەرانی گەلانی ترا سەربنێینەوە.»

کە [شێخ ئەحمەد] و یارانی خۆیاندا بە دەستەوە، [مەلامستەفا]مایەوە سەرخۆی و ٨٠٠ کەسێکی پیاوی جەنگاوەری [بەرزانی]. ئەوە بوو هەر لە کۆششی ئەوەدابوو کە حوکومەت لێی خۆش بێ و لەوڵاتی خۆی دانیشێتەوە؛ کەچی حوکومەت لەباتی داڵدەدانی ـ ئیعلانی ئەحکامی عورفی ـ بۆکرد و وڵاتی «رەواندز» و «زێبار» و «بەرزانی» بەهەموو هێزێکی ئاسمانی و سەرزەوی عێراقی و ئینگلیزی پڕپڕکرد. لەگەڵ ئەماشا هەندێ لە عەشایری ئەو دەورەی دیسان لێ هانداپەوە و بەهەموویانەوە ئەو وڵاتەیان لێ تەنگ کردەوە.

[مەلامستەفا] کەوتە بەینی دووئاگرەوە؛ یائەمەتە ئەبێ خۆی بدا بەدەستەوە و بیبەنە ژێر «سێ دارە»!. یائەمەتە ئەبێ جەنگ بکا، وەکو گەلای‌دار خەڵک بکوژێ و لێی بکوژن!. بۆ ئەوە خۆی لەم دوو ئاگرە رزگار بکا، هیچ چارێکی‌تری نەدییەوە، ئەوە نەبێ کەئەمجارەش خاکی

عێراق بەجێ بێڵێ، چۆنیشی بەجێ بێڵێ؟ ئەو کەوتۆتە بەینی سێ سنوورەوە؛ عێراق، ئێران و تورکیا. هێزە بێ ئامانەکانی ئەم حوکومەتانە سنوورەکانیان وەکو زنجیر تەنیوە!. چار نییە رووبەرووی ولاتان هەر ئەبێ بڕوا.

لە ٢٥ی مایسی ١٩٤٧دا دیسانەوە خاکی عێراقی لە ناو ئەو ئاگربارانەدا بە خۆی و هێزەکەیەوە بەجێهێشت و بەکێوە هەرە بەرز و شاخە هەڵدێرەکانا روو بەولاتی تورکیا رۆیشتن. لە دەورووبەری «تەرگەوڕ» لە خاکی تورکیا نەیروی تورکی سەری رێگەی پێگرتن. خۆیان نەدا بە دەستەوە، هەر بە شاخەکانا رووبەرووی خاکی «ئێران» بوونەوە و لەلا رێگەی کێوەکانەوە رێگەی ولاتی روسیایان گرت، لەژێر پلاری لەشکرەکانی عێراق و تورکیا رزگاریان بوو، نەیروی ئێرانی بە فڕۆکە و تانک بەشوێنیانەوە بوو، ئەمان هەرئەوەندەیان پێئەکرا کە خۆیان لادەن و بەهەموو جۆرێک خۆیان لەشەڕ بپارێزن.

ئەمانە بەمجۆرە بەشاخەکانا بەناو قوڕ و چڵپاوی ئەو کێوانەدا و بەستارگرتن لەناو ئەشکەوتەکانا تەکانیان ئەدا و ئەڕۆیشتن، هەچەندە فڕۆکەکانی ئێرانی هیچ کاتێک نەبووە کە بە سەریانەوە نەبێ، لەگەڵ ئەوەش هەر کۆڵیان نەداوە و سنگی مەردانەیان داوەتە پێش بۆ رۆیشتن تا ئەگەنە گوندی «شەت» ـ کە هەژدە میل لە جنوبی سنووری روسیاوەیە ـ لەوێدا لەشکری چوارەمی ئێران ـ کە رۆژنامەنوسەکانی ئاوروپا بە دە هەزار کەسیان داناون ـ بەتەواوی رێگەیان پێئەگرن و ماوەی دەربازبوونیان نادەن!.

لێرەدا بە بێ ئەوە کە لەدەسەلاتی خۆیانا بێ، تووشیان ئەبێ بە نوروشی شەڕ»وە و لەگەڵ ئەو لەشکرە پڕچەکەی خاوەن فڕۆکە و تۆپەدا ئەکەونە شەڕەوە. لەم شەڕەدا یا رزگار بوونە یاکوشتنی هەموویانە لەو شوێنەدا!. ئەو جەنگە کە لەبەینی بەرزانیەکان و عێزیی ئێراندا روویداوە یەکێکە لە جەنگە هەرە گەورەکانی [بەرزانی] کە لە هەموو جارێک زیاتر گیانی خۆیانیان لە پێناوی شەرەف و بەرزێتیدا دۆڕاندبێت.

لە پاش شەڕێکی چەند رۆژیی لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩٤٧دا ئەگەنە سەر ئاوی «ئاراس». لەشکری سەرزەوی ئێرانی لەپشتەوە بە گوللە تۆپ و فڕۆکەش لەسەرەوە بەبۆمبا رەوانەیان ئەکەن!. کە ئەگەنە سەر ئاوی ئاراس ٥٠٠ کەس ئەبن و ئەوەندەیان ئەمێنێتەوە. زیانی نەیروی ئێرانی لەئەفسەر و سەرباز تەنانەت حوکومەتی ئێرانیش خۆی بەتەواوی لەبەر زۆری بۆی دەرنەکەوتەوە. ئەوەندە هەبوو ئەو نەیروە زۆر بەخراپی شکان!.

لەگەڵ ئەوەش کە لە مەلەوانیدا دەستێکی وایان نەبووە، مل ئەنێن لەئاوەکە، یەکەم کەس کە ملی لێناوە«میرحاج» بووە، پاشان «مەلامستەفا» و ئەمجا هەموو بەرزانیەکان، هەرچەندە زۆر لەشتومەکەکانیان ئاوەکە بردوویەتی، لەگەڵ ئەوەش خۆیان هەر پە ڕیونەتەوە و دەرباربوون بەبێ ئەوە یەکێکیان لێ بخنکێ.

رۆیشتن و دەرچونی [مەلامستەفا]لەو رۆژەدا، بیروباوەڕی پیاوە سیاسیەکانی هەموولایەکی

خەریک کردبوو؛ کە ئایا چۆن توانیویەتی لەناو لێشاوی هێزی ئەو سێ حوکومەتەدا دەربازبێ؟!. ئایا باڵندە بووە و فڕیوە؟ یا ئادەمیزاد بووە و بەجەنگاوەریی تێپەڕیوە؟!.
ڕاست بوو لەو ڕۆژەدا هێزەکانی عێراق و ئێران و تورکیا قۆڵیان کردبوو بەقۆڵی یەکا بۆ گرتن و بۆ لەناوبردنی بەرزانیەکان، بەڵام ئەوی «مەلامستەفا» و بەرزانیەکانی لەناو ئەو هێزانەدا ڕزگار کرد، یەکەم بەجەرگی و خۆبەختکردنی هەموو نەفەرێکی بەرزانی بوو، دووەم سەرکردەیی و پسپۆری شەڕی [مەلامستەفا] بوو کە ڕزگاریکردن؛ ئەو مەلامستەفایە کە هیچ دانشگا و دانشسارێکی جەنگیی نەدیبوو، تەنها قوتابخانەی ژیانی خۆی نەبێ!. تەنها بۆتەی لاپەڕەکانی ژیانی خۆی نەبێ کە تیایا قاڵ ببووەوە، هەر ئەو دەرزی قوتابخانەی ژیانی خۆی بوو کە [قائید] و سەرۆکە جەنگییە دەرچووەکانی قوتابخانەی «حەربی» ئاوروپا و ڕۆژهەڵاتیشی سەرسام کردبوو!.

* * *

[مەلامستەفا]و هاوڕێکانی گەیشتنە ڕوسیا و حوکومەتی سۆڤیاتی داڵدەی دان و بەچاوی پەنابەرانی سیاسیەوە سەیری کردن. لەپاش ئەوە کە لەوێ جێگیر بوون و ئەو تەربییاتە کە لە وڵاتی سۆڤیاتیدا هەیە بۆ پەنابەرانی سیاسی، بۆیان جێبەجێ کرا و ئەمانە ئیتر کەوتنە ناو ژیانێکی هەمەلیەوە؛ جارێ بە جۆرێکی تێکڕایی پێویست بوو هەموو خوێندەوار بن، خرانە بەر خوێندن. پاش ئەو دەورەی سەرەتاییە، کران بە سێ دەستەوە؛ دەستەی گەنج و تازە پێ گەیشتوو، ئەمانە بەرە بەرە ئەبوایە لەسەر خوێندن بمێننەوە تا دانشسار و دانشگاکان تەواو ئەکەن.
دەستەیەکی‌تر خەریکی ئیشی کشت و کاڵ و دار و دەرخت بوون، ئەمانە ئەوانە بوون کە فەرمانیان پێ ئەکرا. دەستەی سێیەم ئەو کەسانانەبوون کە لەبەرئەوە تۆزێ پیر یا تۆزە کەم و کووڕییەک لە لەشیانا هەیە، ئەمانە هەری یەکە مانگی ٥١٥ ڕۆبڵ کە بەپارەی عێراق ١٨ دینار ئەکا، ئەیدرایە و ئیتر هیچ ئیشیان نەئەکرد.
بەمجۆرە بەرزانییەکانی ڕوسیا لەناو کشتوکاڵ و بەرزانیەکانی عێراق لەگۆشەی حەپسخانەکاندا ماوەی ١١ ساڵ ڕایانانبوارد؛ تا شۆڕشە بەناوبانگەکەی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ی عێراق پەیدابوو؛ ئەو شۆڕشە کە کۆتی دیلیی هەموو چینێکی پساند. یەکێ لەو ئیشە هەرە گەورانەی شۆڕش ئەوەبوو کە قارەمانی شۆڕش [عەبدولکەریم قاسم] فەرمانی دەرکرد بۆ لێخۆشبوونی هەموو حەپسە سیاسیەکان. کەئەم فەرمانە دەرچوو [شێخ ئەحمەدی بەرزانی] و هاوڕێکانی لە ١٩٥٨/٧/١٩ دا لە بەندیخانە یانزە ساڵیەکەی هاتە دەرەوە و بەهەموو ئازادییەکەوە چاوی بە ئاسمانی شینی عێراق کەوت، لەسەرەتای ئاغستۆزی ١٩٥٨ دا بە خۆی و هەر بەرزانییەک هەبوو، بەسەر وڵاتەکانی کەرکوک و هەولێر و شەقڵاوادا چووەوە بۆ ئەو شوێنە خۆشەویستەی کە یانزە ساڵ بوو نەیدیبوو، چووەوە و بەهەموو ئازادی و سەربەستیەکەوە باوەشی کردەوە بە بەرزانا.

ئەمجا «مەلامستەفا»؛ و هاوڕێکانی کە دەنگی شۆڕشە پیرۆزەکەی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ی عێراقیان بیست، ئاگری دووری مەڵبەند بڵێسەی لەدڵیانا پەیداکرد و کەوتنە ئەڵهای هاتنەوەوە. لە ٢٨ی ئاغستۆزی ١٩٥٨دا لە چیکۆسلۆڤاکیا ـ وە داوای هاتنەوەی لەسەرۆکی خۆشەویستی شۆڕش ـ عەبدولکەریم قاسم ـ کرد، سەرۆکی شۆڕشیش بەهەموو میهرەبانیەکەوە بانگی کردەوە. ئەویش لەرۆژی ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨دا لەگەڵ «میر حاج» و ئەسعەد خۆشەوی ـ ئەو دوو دۆستە، کە ساڵەهای ساڵە لەگەڵ مەلامستەفا دا یاری بەگیانی خۆیان ئەکەن ـ گەیشتنەوە بەغدا.

بەهاتنەوەی بەغدا ـ یان کوردەکانی هەمولایەکی «عێراق» و تەنانەت عەرەبەکانی عێراقیش رۆژ لە رۆژ زیاتر ئەبارینە بەغدا و پیرۆزبایی ئەم هاتنەوەیەیان ئەکرد. هاتنەوەی «مەلامستەفا» بۆ بەغدا یەکێک بوو لەدەورە هەرە پرشنگدارەکانی کورد کە لە بەغدادا نواندیان.

لەپاش ماوەی بیست رۆژێک «میرحاج» گەڕایەوە بۆ وڵاتی سۆڤیاتی بۆ جێبەجێ کردنی هاتنەوەی ئەو بەرزانیانە کە لەوێ ماون. کاروفەرمانی هەموویان جێبەجێ بوو گەڕانەوە. لەرۆژی ١٩٥٩/٤/١٨ دا ٨٥٣ کەسی ئاوارەی «بەرزانی» لە پاش ١١ ساڵ لەناو دەریایەکی شادمانی دا گەیشتنەوە بەغدا و وڵاتە خۆشەویستەکەیان. لەمانە ٤٥٩ کەسیان پیاوبوون، ١٨٨ ژن و ٢٠٦ یان مناڵ بوون، لەپیاوەکان نزیکەی ٨٠ کەسیان پەڕپوت بیوون. پێشو زییەکی نایابیان لەلایەن هەموو چینێکەوە لەئێستگەی شەمەندەفەر بۆکرا و هەموو بەدیداری دۆستەکانی خۆیان شاد بوونەوە.

وەکو لە پێشەوە باسکرا، کاتێ ئەم بەرزانیانە لە رووباری «ئاراس» پەڕینەوە ٥٠٠ کەس بوون، لەم ماوەیەدا زیاد لەو ئەندازەیە ئەوندە نەتەوەیان لێ کەوتەوە.

***

لەپاش ئەوە کە ئەم کارەساتانەمان زانی، ئەبێ ئەوەش بزانین کە بەجۆرێکی تێکڕایی عەشرەتی بەرزانی لەناو کوردا ئەتوانرێ بە بەجەرگتر و راستگۆتر لەقسە و کردەوە دا و بەگیان بەختکودن لە رێگەی بیروباوەڕدا دابنرێن، لەم رووەوە کەس نایانگاتێ، گەورەیەک و بچوکێکیان، شێخێک و ئومیەکیان، پیرێک و گەنجێکیان، ژنێک و پیاوێکیان، لە بیروباوەڕا، لەزات و زۆرا، لە کۆڕی کورد و کوردایەتیا یەکسانن و یەک بەرگیان هەیە، ئەوشتەی، پیرێک ئەڵهای بۆ ئەکا، عەینی شتە کە گەنجێک داوای ئەکا، ئەو باوەڕەی کە پیاوێک بۆی ئەجەنگێ، عەینی باوەڕە کە ژنێک شیری بۆ هەڵئەگرێ.

لە پێناوی ئەو باوەڕەدا کە هەیانبوو، گەلێ تەنگ و چەڵەمەیان چاوپێکەوتووە، گەلێ چەوسانەوە و برسێتی و رووتی و دیلێتی و غەریبی وڵاتانیان چێشتووە. ئەمانەشیان بۆیە چێشتووە و بینیوە لەبەرئەوە بووە کە باوەڕیان بەو رێگەیە کە گرتوویانە قایم بووە، رێگەکەش رێگەی کوردایەتی بووە، ئەوەندە قایم بووە ناهۆمێدییان نەزانیوە نایزانن، تەنانەت رێگەی ناهۆمێدی نادەن بچێتە دڵی ئەو نەتەوانەیانەوە کە هێشتا نەهاتوونەتە دنیاوە و بۆنی هەوای دنیایان

نەکردووە. لەسەر ئەمە شتێک ئەگێڕمەوە:

ساڵی ١٩٤٧ وەکو ساڵەکانی دەوری عەباسی چۆن پەرێشانیی «بەرمەکیە»کان بوو، بەوجۆرەش نەگبەتی بەرزانیەکان بوو! حوکومەتی ئەو دەورە پشتی تێهەڵکردبوون، وڵاتەکەیان داگیر کرابوو، هەندێکیان لەگۆشەی حەپسخانەکانا بوون، هەندێکیان دەربەدەری وڵاتان بوون، ئەوانەی کەمابوونەوە لەئافرەت و لەمناڵ، بەبرسێتی و بەرووت و قووتی لەژێر ساباتی بەفری سپی ئەوساڵەدا رۆژی رووناکی عالەمی تریان ئەنووسان بەشەوی تاریکی هەموولایەکەوە. تەنها چەرخی فەلەکی ئەو دەورە نەبێ کە وەکو حوکومەتە کە دڵ رەق بوو، بەزەیی پیایانا نەئەهاتەوە ئەگینا هەموو کەسێکی تر بەزەیی پیایانا ئەهاتەوە.

لەو رۆژەدا و لەناو ئەو بەفر و سەرمایەدا ئافرەتێک بە «نۆ» مناڵەوە سەرما و برسێتی دەشتی پێ ئەگرێتە بەر و سەری ئەکا بە ماڵی قائیمقامی [زێبار]دا. ماڵی قائیمقام مەردانە و پیاوانە لێی دێنە دەست، خزمەتێکی باشیان ئەکەن و بە نان و بە بەرگەوە گەرمیان ئەکەنەوە. قائیمقام لێی ئەپرسێ: -لەئافرەتەکە - چۆن بەم حاڵە دەرئەبەی و ئەم مناڵانەت چۆن بۆ بەخێو ئەکرێ؟. ئەڵێ: «بەم رووت و قووتی و برسێتیە هەر بەخێویان ئەکەم بۆ ئەوە لە پاشا حەقم بستێنن!.» ئەڵێ ئەگەر ئەمانەش حەقم نەستێنن -دەست ئەخاتە سەرسکی و ئەڵێ -«ئەمەی لە سکمایە حەقم ئەستێنێ، حەقم ئەستێنێ لەو کەسە کەوا بەمجۆرە دەربەدەری کردین، حەقم ئەستێنێ لەو کەسە کە وڵاتی خۆمان و خاکی خۆیشمانی پێ رەوا نەبینین. دنیاگەلێ دەور و چەرخی هەیە. گوێ مەدەرێ کورد دەرویەکی هەر لێ ئەبێتەوە.»

# شۆڕشی سمکۆ

سمایل ئاغای سمکۆ

١٨٧٥ز ـ ١٩٣٠ز

Ismail Agha 'Simko' (lower centre)
at the height of his influence, *c.* 1921

له پێش ئەوەدا که جەنگی گەورەی یەکەم، واتە جەنگی ١٩١٤ ـ ١٩١٨ بکەوێتە ناوەوە، جۆرە دەور و دووکاتێک لەناوا هەبوو مەگەر دەورەی سەدەکانی ناوەڕاست هاوتایی بکردایە! ئەگینا وێنەیەک نەبوو بۆ ئەوە که پیاو بڵێ ئا بەو جۆرە بووا. ئەم پەردە ڕەنگاورەنگانەش زۆرتر لەوڵاتی کوردەواریدا دێوجامەکانی خۆیانیان پیشان ئەدا؛ ئەو وڵاتی کوردەوارییە کە ئەو سەردەمە بەشێکی لەژێر باری عوسمانیەکانا بوو، بەشێکیشی لەژێر داری ئێرانییەکانا.

بەتایبەتی له وڵاتی ئێرانا چونکه شایەکانی قاجار هاتبوونە دەمە دەمی ئاوابوون، هەموو هێز و توانایەکیان هاتبووە سەر ئەوە که لەقەبی زل زل ببەخشن و هیچی تر.

وا دیاربوو لاسایی ئاخر دەوری «عەباسیە»کانیان ئەکردەوە؛ ئەمانیش لەوان خراپتر لەدەورەی

ئاخریانا هاتبوونە کزی و نابووت ببوون، بێگانەکان ـکە لە ڕواڵەتا و بۆ بەڕێوە چوونی ئیش و کار ـ خۆیان بە دار و دەستەی خەلیفە ئەزانی، بەڵام هەر توانایی و دەسەڵاتێک کە هەبوو لەدەست خەلیفەیان سەندبوو، خەلیفە تەنها ئەوەی بۆ مابووەوە کە لەسەر کورسی خەلافەت بە ناو لەبەغدا دانیشێ و لەقەبی زل زلی وەکو «موعیزئەلدەولە و ڕوکون ئەلدەولە» بەراتکا و هیچی‌تر.

جـــا شـــایەکـــانی قـاجاری ـ ش وەکـو ئـەوان لەقـەبێکیان ئـەفرۆشت بـەوڵاتێک. «موفەخەمولمەلیک، موکەڕمولسەڵتەنە، فەرمانفەرما، سالارئەسعەد و سالار فـاتیح» هـەموو لە پاشەرۆکی لەقەبەکانی ئەوان بوون. «موکەڕمولسەڵتەنە» و «موفەخەمولمەلیک» مووچەیەکیان ئەدا بە شاهەنشا و ئیتر خۆیان چییان لەگەڵ ڕەعیەت و مسکێنا ئەکرد، ئەیانکرد و لێپرسینەوە نەبوو.

ئەمە لەلایەکەوە تا دەوریێک، لەلایەکی‌ترەوە لەدەورێکی‌ترا «سەرجوقە»یەک لەپانی و درێژی هەر ولاتێکا هەر جۆرە زوڵم و زۆرێکی بکردایە، کەسێک نەبوو شکاتێکی لابکرێ، چونکە سەرجوقە بە شیر و شەکر دەمی «سەرتیپ»ی شیرین کردبوو، ئیتر خوامەرگی ئەو کەسەی ئەدا کە ئەچوو دەردەدڵێکی لای سەرتیپ ئەکردا.

بەشەکەی «تورکیا»ش هەر بەوجۆرە بوو؛ «زەفتیە»یەک حوکمی «یوزباشی» ئەکرد و یوزباشی هی بین باشیا. لەلایەن سوڵتانەوە کە کاربەدەست و والیەکان ئەنێرانە سەر ولاتـەکان، وەکو «مزەئاش» ئەبوا پێشکەشیان بکردایە، جا خۆیان بە چ ئینسافێک ئەکەوتنە ڕێزەی خەڵک، ئەوە مەگەر هەر خۆیان بیانزانیایە.

ولاتی کوردەواری «ئێران» زیاد لە کوردەواری شوێنەکانی‌تر لەژێر بـاری زوڵـما ئـەتلانەوە؛ هەندێک بەدەست دەرەبەگی «سالارفاتیح» و «مفخم‌الملک»ەکانەوە، هـەندێکیش بـەدەست «سەرجوقە» و سەرتیپەکانەوە... ئەمانە هەموو دووکەڵی لە دڵی ڕەمەکی مەردما هەڵئەساند و هیچ چارێکیش نەبوو، ئەگەر جارجار یەکێک هەڵبکەوتایە و داوای حەقێکی بکردایە، مفخم‌الملک ـ ە خۆ خۆرەکان وەکو کرم ئەکەوتنە لەشیەوە و دایانئەڕزاند.

کە شەڕی ١٩١٤ ـ ١٩١٨ داهات، باوەڕ و فیکری لە بارێکەوە خستە بارێکی‌تر. بە جۆرێکی تێکرایی ئەو جەنگە نەخشەی هەموو قەومەکانی گۆڕی، نەخشەیانی گۆڕی تەنها هـی قـەومی کورد نـەبێ. نـەخشەی زەوی و زاروسـەربەستی قـەومی کوردی نـەگـۆڕی، بـەڵام نـەخشەی بیروباوەڕی گۆڕین. ئەمەی کرد لەلایەکەوە لەلایەکی‌تریشەوە کوردەکانی ولاتی ئێران پریشکێکی کەساسی زۆریان بەرکەوت، پریشکێکی واکە زۆربەیانی دەربەدەر و سەرگەردان کرد. ئەمەیان لە دەورێکا بوو کە ئینگلیز ئەیوت داڵدەی قەومە کەساسەکان ئەدەین!. قسەکـەیان ڕاست بوو داڵدەیان ئەدان، یەکێک لەو قەومانە قەومی کورد بوون کە لەو تەئریخە بەدواوە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بەقوڕا ئەچوون، ئەمەبوو داڵدەانەکەیان. هەزار ڕەحمەت لە کفن‌دزا!.

* * *

لەولاتی شوکاک، لە «چاریە ـ چەهریق» لە بناری «زۆزان» هە. لەپێش ١٩١٤دا «سمایل ئاغای سمکۆ» ناو و ناوبانگی دەرکردبوو، هەستێکی میللیەت و قەومیەت کەوتبووە کەللەیەوە.

«سمایل ئاغا» لەبنەماڵە بوو، کوڕی «محەمەد ئاغا»ی شوکاک .وو، ئەو شوکاکە کە بە «شەش» هەزار بنەماڵە و ٣ هەزار تفەنگ دانراون. محەمەدئاغا دەستە جڵەوی هەموو عێلی شوکاکی بەدەستەوە بوو، لەئەستەموڵ و لە تاران ناسراو بوو، ئەو وڵاتەش هەموو فەرمانیان بەڕێوە ئەبرد. بەڵێ لەژێر دەوارا بوو، بەلام ستونی دەوارەکەی وڵاتەکانی تەرگەوڕ و مەرگەوڕ و سندوس ـ ی ئـەهێنایە لەرزە، نـە رێگـەی تـورکی ئـەدا لە «سـایەتقەلا»وە بێت بەسەریا، نە هی ئێران لە «زۆزان»ەوە!.

جا «سمایل ئاغا» کوڕی ئەم «محەمەدئاغا»یە و لە عەشرەتی «عەبدۆی» بوو، کە عـەشرەتی عەبدۆییش لە بنەڕەتا یەکێک بوون لە تیرەکانی «میلانی» و لە وڵاتی «دیـاریەکـر»ەوە هـاتوون. سمکۆ لەژێر ئەودەواری گەورەییەدا چاوی پشکوتبوو. هـەر لەو دەورەدا لە پاشماوەی بـاوکی «جەوهەرئاغا»ی برای ـکە «جەعفەرئاغا» شیان پێ ئەوت ـشیری، کاری ئەکرد. و دەوری ئەگێڕا، وڵاتی «ورمێ» و «میاندواو»ی والیکردبوو، بە وڵاتی خۆی ئەزانی.

دوور نەبوو «جەوهەرئاغا» بەناوی هەستی میللیەتەوە ئـەمانەی نـەکـردبێ، بـەلام ئـەوەندە هەبوو هەستێکی دابوو بەدەر و دراوسێکانی و حوکومەتی «تاران» و «تـەورێز» بـە چـاوێکی‌تر تەماشایان ئەکرد. لە ١٨٩٥دا بە هەر جۆر و بەهەر زمـانێک بـوو، حـوکومەتی تـەورێز بـەناوی بانگهێشتن و دۆستایەتیەوە «جەوهەر ئاغا»ی بانگ کردە تەورێز، لەوێ شـەو لە نـاکـاوێک لەو کۆشکە، کە بۆ میوانداریی ئەویان تەرخان کردبوو، دەوریان لێدا، دوانزە پیاوێ لەگـەڵ هـەبوو، خـۆی و پیاوەکـانی تـەنها دووکـەس نـەبێ کـەسیان لێ دەرنـەچوو هـەموویان کـوشتن!. ئـەم دووکەسەش یەکێکیان «مـەحمودئاغا»ی نـاوبوو، پاشان هـەر .ـە دەستوری پێشوو، بـوو بـە پیاوماقوڵی «سـمایل ئاغا». کـارەساتی کـوشتنی «جـەوهەرئاغا» ئـاگـرێکی کـارێگەری لە دڵـی سمایل ئاغا ـ دا هەڵگیرساند و هەر ئەمەش بوو کەبوو بە بناغەی میللیەت و قەومیەت بۆی.

«سمایل ئاغا» پیاوێکی جەربەزەی نەترسی جەنگاوەر بوو، هێزی قسە و داڕشتنی قسەی لە وانە بووە بەردی نەرم کردووە، لەگەڵ هەر کەسێکا کەوتبێتە قسە رایکێشاوە بۆلای خۆی، ئـەو کەسە با دوژمنیشی بوایە پێی ئەسەلماند کە ئەم لەسەر حەقە، لەگەڵ ئەوەشا پیاوێکی بەسام و ترسێنەر بووە، نەخوێندەواریش بوو.

دیسان کاتێ کە بیویستایە لەگەڵ یەکێ لە کاربەدەستی حوکومەتەکانا، یا یکێکی‌ترا کە سەر بەو نەبوایە بۆ قسە و باس چاویان بەیەک بکەوێ، شوێنێکی تایبەتی دیاری ئەکرد بۆ ئەو چاو پێکەوتنە. ئەمجا لە پێش وادەدا خۆی زەلام و تفەنگچی ئەنارد ئەو ناوچەیەیان تاقی ئەکردەوە. بۆ ئەوە بزانن دوژمن لەو ناوچەیە دا خۆی حەشار نەداوە. پاش ئەم ئیشەی ئەیهێنا تفەنگچیەکـی زۆری ئەنارد لەو ناوچەیەدا بڵاوەیان ئەکرد و سەر لووتکە و تەپۆڵکەکانیان ئەگـرت و هـەموو

شوێنێکیان قایم ئەکرد. ئەو وەختە سمایل‌ئاغا خۆی ئەچوو لە شوێنی ژووانەکە لەگەڵ کابرادا یەکی ئەگرت و قسە و باسی خۆیان تەواو ئەکرد.

«سمایل‌ئاغا» کە خەبەری کوشتنی «جەوهەرئاغا»ی برای بیست، بڕیاری دا سەرەتا هەر بە دوانزە کەسەوە تۆڵەی خوێنی جەوهەرئاغا بکاتەوە، بۆیەش هەر بە دوانزە کەسەوە، چونکە «جەوهەرئاغا» دوانزەکەسی لەگەڵابووە! بەم ڕێچکەیەدا ڕۆیشت تا دەوروبەری «ورمێ»و «مەراغە»ی هەموو شڵەژاند و هەتا ئەهات ناو و ناوبانگی زیادی ئەکرد، لەگەڵ ئەمەشا بڵێسەی دڵیشی هەر زیادی ئەکرد!.

«سمایل‌ئاغا» بەرەبەرە گەورە بوو، بڵێسەی ئاگرەکەی دڵیشی زۆرتربوو. جەنگی ١٩١٤ـ١٩١٨ بە سەراهات و ئەو باوەڕە کەوتە هەموولایەکەوە کە هەموو قەومێک هەقی ژیان و سەربەخۆیی هەیە. لێرەدا ئەم باوەڕە و ناسۆری برینی «جەوهەرئاغا» هەردووکیان پاڵیان نا بە «سمایل‌ئاغا»وە. لەملاشەوە «سەییدتەها ئەفەندی نەهری» ئەوەندەی تر گیانی میللیەتی لە دڵی «سمایل‌ئاغا» دا بە هێزتر کرد و پشتی‌دا بە پشتیەوە.

«سمایل‌ئاغا» لە ناوەندی شەڕی ئەو ساڵانە دا لەگەڵ روسەکان ڕێک بوو، پاشان لەگەڵیان تێکچوو، رووی کردە تورکیا و لەگەڵ حوکومەتی تورکیادا ڕێکەوت، لە ١٩١٧ داکە «باڵشەویک» لە وڵاتی روسیادا پەیدا بوو، ئەمگەڕایەوە بۆ وڵاتی «ئێران».

* * *

روسەکانی قەیسەری ئەیانویست لەو وڵاتەدا بەرانبەر بە «باڵشەویک» کوسپێک پەیداکەن، لەگەڵ ئەمەدا لە دڵا لەو فیکرەشدا بوون کە دەنگێکی کوردایەتی لەو ناوەدا هەبوو، ئەو دەنگەش لەناو بەرن!. بۆ ئەم مەبەستانە نەیانئەتوانی «سمایل‌ئاغا» بگرن بەدەستەوە، چونکە ئەیانزانی هەر کە سمایل‌ئاغا بکەوێتە تەنگ و چەڵەمەوە، ئەچێتە خاکی «تورکیا» و لەو خاکەشا کورد زۆرە ئەتوانێ بە هەموو جۆر بەرهەڵستی ئەمان بکا و حوکومەتی تورکیا ـ ش دەنگ نەکا، زیاد لەوەش پشتیوانی بکا!.

«مارشەمعون» سەرۆکی هەرگەورەی «تەیاری ـ فەلە»کان بوو ـ هەم سەرۆکی دینی، هەم هی دنیایی ـ لەم تەیارییانە گەلێکیان لە ئاورووپا و وڵاتی روسیا دا خوێندبوویان، لەهەموو روویەکەوە ئامادەی هەموو چەشنە شتێک بوون. هێزی چەکیان دانرابوو بە ٢٥ هەزار تفەنگ و تفەنگ بەدەست، فیداکاربوون بۆ هەر شتێک پێیان بۆترایە. ئەمانەش هەموو دەربەدەری وڵاتەکانی خۆیان بوون ـ زیاتر لەوڵاتی تورکیادا ـ بەتایبەتی کە حوکومەتی عوسمانی بەسەرکردەیی «عەلی ئیحسان پاشا» هێڵجاریی لێکردبوون، زۆریان کەوتبوونە ئەو ناوە و لەو ناوەدا کۆبوونەوە و «مارشەمعون» گەورەیان بوو، ئەوەندەیان چەوساندنەوە دیبوو لەدەست حوکومەتی تورک بەهەر چەشنێک و بەقسەی هەرکەسێک بگەیشتنایە بەسەربەخۆیی ئەیانکرد.

روسەکان هاتن «مارشەمعون»یان راست کردەوە و قسەیان لەگەڵ کرد و هەموو جۆرە

پەیمانێکیان دایە. لەو وڵاتەدا «سمایل ئاغا» هەیە، بوونی سمایل ئاغا کوسپێکی هـەرە زلە، چ لە رێگەی قەیسەریەکانا، چ لە رێگەی «مارشەمعون»دا. چاری ئەمە ناکرێ مەگـەر بـەوەنەبێ کـە «مارشەمعون» لەگەڵ «سمایل ئاغا»دا بکەونە قسە و بەڵکو بە بارێکا ئیشی لەگـەڵا یـەکلایی بکاتەوە.

هێنای سەرەتا بەناوی ئەوەوە کە حکومەتێکی «کوردی ـ ئەرمەنی» درووست بکەن، لەگەڵ «سمکۆ» کەوتە قسـەکـردن، بـەڵام لە راسـتیدا ئـەیویست لەم رێگـەیەوە لە ئـاخرا [سـمکۆ] و کـوردەکـان لەنـاوبەری و راسـتە و راست حکـومەتەکە بـبێ بـە حـوکومەتێکی «ئەرمەنی» و «ئاسوری».

ئەمەش راست بوو و وابوو، چونکە هێزی «مارشەمعون» ـ وەکو وترا ـ ٢٥ هەزار تفەنگچی رێکوپێکی خاوەن مەشق بوون، هەموو لەژێر چاوێری ئەفسەرانی نیزامی دا بوون، لەپشتیشەوە روسی قەیسەری پشتیوانیان بوو. هێزی «سمایل ئاغا» نە ئەو ئەندازەیە بوو، نە ئەو رێکوپێکیەی هەبوو. هێزی ئەم عیبارەت بوو لە هێزی عەشایر، کەسێکیش نەبوو لە پشتیەوە کە بـە چـەک و جبەخانە یاریەی بدا. کەوا بوو لەناوبردنی [سمکۆ] بۆ [مارشەمعون] وەکو ئاو خواردنەوە وابوو. [سمایل ئاغا] لەم کەین و بەینانە هەموو تێگەیشت و هەموو شتێکی بۆ دەرکەوت. تێگەیشت ئەگەر ئەو نەکەوێتە خۆی بۆ لەناوبردنی مارشەمعون، مارشەمعون ئەو لەنـاو ئـەبا و پـاشانیش دەستی بە هیچ لایەک ناگا. لەپاش قسە و باسێکی زۆر لە ئاخر و ئۆخری ساڵی ١٩١٨ دا، واتە وەختێک بـوو شـەڕی گـەورە لە دوایـی هـاتبا بـوو، بـڕیاریان دا کـە لە [کـۆنەشار] لە بـەینی «سـایەنقەڵا» و «چـەهریق»دا لە مـاڵی «تـەیمور ئاغا» نـاو کـۆبنەوە و قسـە لە دامـەزراندن و درووستکردنی ئەو حکومەتەوە بکەن کە نیازیان هەیە دایمەزرێنن. مەرجی ئەم کۆبوونەوەیەش ئەوەیە کە هیچیان هێزێکی وایان لەگەڵ نەبێ.

لە رۆژ و وەختی ناو براوا [مارشەمعون] بـەخۆی و سـەد کـەسەوە گـەیشتە [کـۆنەشار] و «سمایل ئاغا»ش بە ١٥٠ سوارەوە گەیشت و هەردوولا دابەزین*. سمایل ئاغا سوارەکانی خۆی تەمێ کردبوو کە هەموو ئامادە و دەست لە سەر تێسکەی تفەنگ بن، هەر کە ئەم تەقەی کـرد،

---

* ـ هاتنی «مارشەمعون» بولای «سمایل ئاغا» دەستوری رەسمیاتی پادشاهی پیشان ئەدا:

خۆی لە جل و بەرگی ئاڵ و واڵای سەرۆکی رۆحانی ئیمرۆی تیریەکی خاوەن دەسەڵات، و پادشایەکی بەهێزی سبەی رۆژیانا. لەسەر «دروشکە»یەکی چوار ئەسپی دانیشتووە کە هەموو چێوبەندی دروشکەکە بە ئاڵتون زەرکفت کراوە. شەش ئەفسەری گەورە ـ کە چوار لەمانە لە ئەفسەرەکانی روسی ئەو دەورە بوون ـ دوویان لە پێشیەوە لەسەر دروشکەکە و چواریان لە پشتیەوە راوەستاون و شیرەکانیان بە رووتی راگرتووە و کالانی شیرەکانیان لەگەڵ مشتووەکانیانا هەموو زێڕوت، «مورەسەع» بوو تیشکی هەتاوەکە ئەیدا لەم ئاڵ و واڵای پادشاهیە، سامێکی خستبووە ئەو ناوە. «مارشەمعون» بەمجۆرە هاتە، هات و لە ماڵی تەیمور ئاغا دابەزین.

ئەوانیش بە جارێ بیکەن بە شێلک. ئەوەندە هەبوو هەموو سوارەکان بەتەواوی لەمەبەستی «سمایل ئاغا» تێنەگەیشتبوون، واتە نەیانئەزانی کە ئەم نیازێکی وای هەیە، بەڵام سام و ترسی «سمایل ئاغا» لەوانە نەبوو کە کەس بتوانێ بێ فەرمانیی بکات.

لەپاش کۆبوونەوەی «سمکۆ» و «مارشەمعون» بە جووتە لەژوورەکەدا و پاش نان خواردن و قسەکردنێکی زۆر، لەبەرئەوە کە مەبەستی «سمایل ئاغا» رێ نەکەوتن بوو، بەبێ ئەوە بگەن بە شتێک هەستان و سمکۆ مارشەمعونی بەڕێ کرد تا بەرقاپی، تەنانەت لەکاتێ جیابوونەوە دا ئەفسەرەکانی لەگەڵ «مارشەمعون» ویستیان یەکە یەکە دەست بخەنە ناو دەستی «سمایل ئاغا»، «سمکۆ» دەستی نەدانێ و تێکڕا سەلامێکی گرت بۆ هەموو، ئیتر رۆیشتن و سوارەکانی تەیاری ـش هەموو سواربوون و ئامادەی رۆیشتن بوون. لەوکاتەدا کە «مارشەمعون» لە «سمکۆ» جیابووەوە و سەری ولاغی سووڕاندەوە، «سمایل ئاغا» تۆزێ دوور کەوتبووەوە، لە ناکاو هەڵیکێشایە دەمانچە و دەمانچەیەکی نایەمارشەمعونەوە! ـکە لەناو سوارەکانی خۆیا بوو ـ کەتەقەی دەمانچەی «سمکۆ» هات، تفەنگچی شوکاک ـکە لە پەنادیوار و شتەدا خۆیان حەشار دابوو ـ بەجارێ لەتێسکەی تفەنگ خێراتر دەرپەڕین و کردیان بەشێلکی لەسەریەک لەسەریەک لەتەیارییەکان. دەستەی مارشەمعون و تەیاری، تا هۆشیان هاتەوە بە خۆیانا تەنها تاقە زەلامێکیان لێ دەرباز بوو. ئەو تاقە زەلامەش براکەی «مارشەمعون» خۆی بوو کە لە پاشا نیشتەجێی مارشەمعون و بوو بە سەرۆکی رۆحانی. مارشەمعون خۆی و ٩٩ پیاوی لەو شوێنەدا کوژران گەورەتر کارەساتێک لە لاپەڕەی ژیانی سمکۆدا لەو شوێنەدا روویدا.

کە ئەم کارەساتە قەوما، «سمایل ئاغا» فەرمانی دا کە ئیتر ئەو شوێنە بەجێ بێڵن، چونکە ئەیزانی فەلەکان لە خوێنی «مارشەمعون» واز ناهێنن و زۆریشن، ئەمان چاریان ناکەن. لە راستی دا تا ئەمان کەوتنە خۆیان بۆ ئەوە کە هیچ ماڵ و خێزانێک لەوێندا نەیەڵن لێشاوی فەلە ـی نیزامی گەیشتن. بەڵام تازە ئەمان رزگار ببوون و بەقنگە شەڕ خۆیانیان گەیاندەوە «چەهریق».

کە چوونەوە «چەهریق» لێشاوی «تەیاری» هات و دەورەی چەهریق ـیان دا و «سمایل ئاغا»یان بە تەواوی ئابلۆقە دا و رێگەی دەرچوونیان بڕی!. لەپاش ماوەیەک سەیری کرد ئەگەر ئیش بەمجۆرە بڕوا خۆی و هەموو سەربەوبووەکان لەو شوێنەدا بەدەست ئەم تەیاریانەوە ئەڕۆن.

هێنای لەگۆشەیەکی ئابلۆقەکەوە هێرشێکی مەردانەی کرد و لەوگۆشەوە دڕنی بەتەیاریەکان دا و خۆی لە ئابلۆقەدان رزگار کرد و روو بە رووی شاری «خۆی» بووەوە. شاری داگیرکرد و لەوێندا ئیتر بەسانایی دەسگای دەسەڵاتی خۆی لەو ناوەدا بڵاوکردەوە. «فەلە»کانیش بە کوشتنی مارشەمعون ـی سەرۆکیان و بەدەربازبوونی «سمایل ئاغا» لە چەهریق کاروباریان تێکچوو، ئیتر خۆیانیان نەگرتەوە.

دیسان لەو سەردەمەدا کە لە شاری «خۆی» بوو، حوکومەتی تورکیا کەوتە راونانی

ئەرمەنیەکانی ناو خۆی و ئەمانە ناچار بوون بەهەڵاتن. «سمکۆ» بۆ ئەوە کە لەترسی پاشەڕۆژیان بە جاریێ رزگار بێ، هێنای دەربەندی «قوتور»ی لێ گرتن و هیچ دەنگی نەکرد تا بەتەواوی هاتنە ناو دەربەندەکەوە، لێیەدا لێیان راپەڕی و ئەویش کوشتارێکی بێ ئامانی لێکردن. بەم ئیشەی خۆی لەترسی پاشە رۆژی ئەوانیش رزگار کرد.

لەبەرئەوە کە هەندێ کەس لە نووسەران وای پیشان ئەدەن کە «سمکۆ» بە هەڵەدا چوو «مارشەمعون»ی کوشت و لەکوشتنەکەی زیانی بە کورد گەیاند. من ئەم حەقایەقەم لێرەدا نووسی، لە پاش خوێندنەوەی ئەتوانن حوکمی خۆیان بدەن و ئەو وەختە بۆیان دەرئەکەوێ کە «سمکۆ» چاکی کرد یا خراپ.

«سمایل ئاغا» بە کوشتنی «مارشەمعون» پیلانی گەلێ کەسی تێکدا؛ ئامانجی ـ روسیای قەیسەری ـ هەڵوەشاندەوە. لەبەرئەوە ئاخروئۆخری شەڕ بوو ئینگلیز گەلێ ئیشی بەدەستەوە بوو بە «فەلە»کان بەرانبەر بەو ولاتانە، تەونەکانی ئەوی پێ لەناو درا. حوکومەتی قاجاری ـ ش ئەوە هەر بە هێزی شەڕەوە لەژێر پێدا چووبوو لەوانە نییە ناوبرێ بۆ ئەوە کە نەمانی «مارشەمعون» کاریگاتە سەر ئەو یا نەیکا، ئەوەندە هەبوو بێ تیینی حوکومەتی قاجار و نەمانی «مارشەمعون» هێزێکی گەورەبوون بۆ پێشکەوتن و پەرەسەندنی «سمایل ئاغا» لەو ناوەدا.

زۆری پێ نەچوو سمایل ئاغا ولاتەکانی «تەرگەوەڕ» و «شاروێران» و «ورمێ» و «میاندواو»ی پاک کردەوە، تاگەیشتە سەر سنووری تورکیا هەمووی داگیرکردن و هەر عەشایرێک لەو ناوەدا هەبوو، هەموو پاڵیان پێوەدا وکەوتە تەمای داگیرکردنی تەورێز؛ داگیرکردنی ئەو شارە کە خوێنی «جەوهەر ئاغا»ی برای تیا رژێنراوە.

لە قۆڵەکانی ناوبانی ئێرانا پشێویی زۆرتر هەبوو، «رەزاخانی پەهلەوی» لە ١٩٢٠ دا «تاران»ی گرت، بەڵام ئاژاوەی ئێران وەنەبێ لە نیشتنەوەدا بووبێ؛ لە ولاتی خوزستان «شێخ خەزعەل» خەریک بوو، «بەختیاری» و «قەشقایی» خەریک بوون. «قەدەم خەیر» لەولاتی لوڕ و پشتکۆ دەستی دابوویە. بە کورتی لە هەمولایەکەوە هەر کەسە بۆ خۆی و هەرکەسە بە ناوێکەوە لە ئیشابوو.

«سمایل ئاغا» لەملاوە ولاتەکانی رۆژئاوا و شیمالی رۆژئاوای بە چنگی حوکومەتی ئێران هەڵپروکاندبوو، وردەوردە رووی کردبووە ولاتی «بانە» و «سەقز». «بەهادورئەلسەڵتەنە» هەبوو لەلایەن ئێرانیەکانەوە حاکمی سەقز بوو، «بانە» کەوتبووە ژێر حوکمی «سمایل ئاغا»وە. لەژێرەوە خەبەری نارد بوو «سەییدتەها» ـ کە ئەو وەختە ئەو لە دەوری بانە بوو ـ لەگەڵ بانەیی دا بێن و «سەقز» بگرن. لەعەینی وەختا رۆیشتن و ـ بەهادورئەلسەڵتەنە ـ سەقز ـ ی دان بەدەستەوە، «بانە»یی کەوتنە سەر ئەوە کە ناوشاری «سەقز» تالان کەن. شوکاکەکانی «سەییدتەها» و بەرەی «فەیزوڵلابەگی» بەرەنگاریان بوون و سەقز ـ یان لەدەست بانەیی پاراست. لەئاخرا «سمایل ئاغا» تەمنیەکی باشی بانەییەکانی کرد لەسەر ئەو فیکرە ناشیرینە کە کردبوویان.

هەر لە «سەقز»ەوە لەشکری «سمکۆ» بەسەر «خورخورە» و «تیلەکۆ» و «دیواندەرە» دا چوونە شاری «سنە». کلاوە درێژەکانیان کە دەورە درابوون بە مشکی و سرکەیی، لەگەڵ «ستارخانی» و فیشەکی چوار ریزەی ناوقەدیان و رەختی ئەسپەکانیان، ئەمانە هەموو بە کوردەکانی سنە ـ یان ئەوت کە «سمایل ئاغا» کۆشش بۆ سەربەخۆیی کورد ئەکا، ئەم دیمەنانە زاتێکی تەواویان خستبووە بەر ئەوانیش.

«رەزاخان» هێشتا نەببوو بە شای «ئێران»، دەورێک بوو، وەزیری جەنگ بوو، ناو و ناوبانگی سمایل ئاغای لەوڵاتەکانی «خۆی» و «سەلماس» و «ورمێ» داگەیشتبووە هەموو لەشکری ئێران، هەر لەشکرێکی کە بۆ ئەتێررا لەناوی ئەبرد.

«شێخ عەلی نیسکی» هەبوو ـ کە پەڕاگندەیەکی قەوقاز بوو ـ حوکومەتی ئێران پەنای دابوو، کابرایەکی بە کاریش بوو، «رەزاشا» لەسەرەتای ١٩٢٢دا ئەم کابرایەی بە ٥٠٠ سواری عەشایری خۆیەوە ناردە سەری.

«شێخ عەلی» رووی کرد بۆ «سابلاخ» لەوانە بوو بگاتە ناوشاری سابلاخ، «سمایل ئاغا» بەرەنگاری بوو، بەدەردێکی برد کە ئاوازەی شکان و تیاچوونی «شێخ عەلی نیسکی» لەو وڵاتەدا بوو بە گۆرانی و چاوی لەشکری ئێرانی لەم ئیشە بەتەواوی شکا. پاش ئەم کارەساتە «مازۆر نەسروڵلاخان» هەبوو، حوکومەتی ئێران بە «سێ» فەوجی سەربازی نیزامیەوە ناردی بۆ سەر «سمکۆ»، «سمایل ئاغا» لە چەمی موکریان بەرەنگاری بوو، ئەمەشی بە جارێ تاورمار کرد.

لەم دەورانەدا سمکۆ، «شێخ سەراجەدین» و «فەلاّمەرز» ناوانی بە راسپێریی نارد بۆ وڵاتی هەورامان بۆلای «جافرسان»، کە ئەو لەوێوە پەلامار بدا و ئەمیش لەملاوە، بۆ ئەوە بە جارێ ئەوی پێی ئەڵێن وڵاتی کوردەواری ئێران، لە «عەجەم» پاکی کەنەوە و ئیتر ئەو وەختە ئەبێ بەوڵاتێکی سەربەخۆ. «جافرسان» ئەم قسەیەی نەچوو بە گوێچکەدا و وازی لە فیکرەکەی سمایل ئاغا هێنا.

لەم ماوانەدا «سمایل ئاغا» سنووری وڵاتی خۆی بەتەواوی پەرە پێدا، لە «شنۆ» و «لاجان»ەوە تا «ورمێ» و «سایەنقەڵا»، لە «زۆزان» و «چەهریق»ەوە تا «سەقز» و «بانە»؛ ئەمانە هەموو بە عەشایرەکانیەوە کەوتنە ژێر چاوێری و فەرمانیەوە. «ئەحمەدئاغا» ناوێکی خەڵکی ئەو بەری «چەغەتوو»، حوکومەتی ئێران راستی کردەوە بۆ بەگژاچوونی «سمایل ئاغا». ئەم پیاوە بە «پێنجسەد» سوارەوە هات بۆ بەگژاچوونی سمایل ئاغا. لە «شەکریازی» هەر دوو لەشکر بەرەنگاری یەک بوون، ئەوەندەی فوو لە ئاو بکرێ، لەشکری «ئەحمەدئاغا» وەکو ئاگری قودرەتیان تێکەوێ هەموو لەناو چوون و «ئەحمەئاغا» خۆیشی کوژرا.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٢٣ دا «ئەمیر ئەرشەدی ـ قەرەچەداغی» لەبناری تەورێز بەنیازی لە ناوبردنی «سمایل ئاغا» بە هەزار سوارەوە روو بە وڵات و خاکی سمایل ئاغا بەرێ کەوت. ئەم خەبەرە گەیشت بە سمایل ئاغا، «سمایل ئاغا» بە خۆی و هەندێ لەشکرەوە چوو بە پێشوازیەوە، لە شیمالی دەریاچەی «ورمێ» تووشی بوو، زۆری نەخایان «ئەمیر ئەرشەدی» و لەشکرەکەی ئەو

تۆزەکەمەی کە لە دەست کوشتن رزگاریان بوو، بەرەودوا گەڕانەوە و ئەوانیش هیچ چارێکی «سمایل ئاغا»یان بۆ نەکرا.

زەبر و زەنگی «سمایل ئاغا» لە هەموو ولاتەکانی دوور و نزیکدا دەنگی دایەوە، کە ئەو دەنگە تا ئەو وەختە بۆ کەم کەس بەوجۆرە پەیدابیوو. تەنانەت وای لێهاتبوو زۆرتر سەرکەوتنەکانی هەر ناوەکەی سەری ئەخستن؛ واتە کە هەر ئەوترا «سمایل ئاغا»، یا لەشکری شوکاک، دوژمن بەجارێ ورەی بەر ئەدا و ئەشکا، خۆ لەسەر تەعبیری خۆی، کە بە ئێرانیەکانی ئەوت «عەجەمەکان»، هەر کە ناوی سمایل ئاغا ـ یان ئەبیست، هەر چەند لەشکر بوونایە ئەبوایە هەموو چەکیان بدایە بەدەستەوە و گیانی خۆشیانیان بخستایەتە بەرپێی «سمایل ئاغا».

ئەوانیش بۆ لە ناوبردنی ئەم، وەنەبێ درێغیان بکردایە، زیاتریش بە کردەوەی فڕوفێڵ، وەکو ئەوە کە لە ئاخر و ئۆخری ساڵی ١٩٢٤ دا «سمایل ئاغا» لەسەر سنوورەکانی تورکیا و ئێرانابوو، هات و چۆی لەهەر دوو خاکەکەدا ئەکرد و خۆی حاکمی ئەو ناوەبوو، کەس پێی نەئەکرا رێگەی لێ بگرێ.

«سەلمان سەبری» هەبوو، حاکمی «وان» و پاشان بوو بە «والی» وان، ئەم پیاوە لەگەڵ سمایل ئاغا ـ دا دۆستایەتیەکی راستەقینەی دوور لە دبلۆماسیەتیاد. هەبوو. سمایل ئاغا لەدیدەنی ئەو ئەگەڕێتەوە، «رەشید جەودەتی» دۆستی ـ کە دیاری ولاتی سولەیمانی بوو لەگەڵیا ـ لەگەڵی ئەبێ. هێشتا ناگەنەوە بەشە خاکی «ئێران»، تومەس ئێرانییەکان پاوێک ئەنێرن، بۆ ئەوە بەهەر جۆرە بووە، بەڵکو بەدزی «سمایل ئاغا» بکوژێ.

«سمایل ئاغا» بەم کابرایە ئەزانێ و ئەیگرێ و پێی دەرئەخا کە بۆ ئەو مەبەستە هاتووە، کە تووشیشی ئەبێ لە بەشە خاکی تورکیادا ئەبێ، لەگەڵ خۆی ئەیهێنێتەوە تا ئەگەنەوە سەر سنووری ئێران؛ فەرمان ئەدا مەنجەڵێ رۆن لەناو خاکی ئێرانا داخ ئەکەن و هەر دوو دەستی کابرا ئەبڕێ و ئەیکا بەمەنجەڵە رۆنەکەدا و بەمجۆرە بەبێ دەستی ئەینێرێتەوە بۆ ئێرانیەکان.

لەرووی دۆستایەتیە تایبەتیەکەشیەوە، ئەم باس و خواسە ئەگەیەنێ بەسەلمان سەبری. «سەلمان سەبری» کردەوەکەی بەلاوە زۆر سەیر ئەبێ، هەر بەناوی ئەم دۆستایەتی و ئازایەتی سمایل ئاغاوە، ئیشێکی وا ئەکا «خەسرەو»ی کوڕی ـ کە وەختی خۆی تورکەکان لەشەبەیخوونەکەدا گرتبوویان و مناڵ بوو ـ بەرەڵای ئەکەن و ئێنێرنەوە بۆ «سمایل ئاغا».

«رەشید جەودەت» وتی لە مەردایەتی و ئازایەتییەکانی سمایل ئاغا کە ئەو دوساڵە پێکەوە بووین، ئەوەم بە یادگارێکی زۆر گەورە هەڵگرت لەژیانما کە لەپاشا یەکێ لە کوڕەکانم ناو نایە «خەسرەو»، ئەمەش هەر بۆ یادی مەردایەتی پیاوێکی ئازای وەکو «سمایل ئاغا» و بۆ ئەو دۆستایەتیە کە لە بەینمانا هەبوو.

* * *

دەورەی جاری دووەمی حوکومەتی «شێخ مەحمود» بوو لە سولەیمانی، ناوبانگی

حوکومەتی کوردستان گەیشتبووە هەموولایەک، زۆر لە مێژ بوو سمایلئاغا ئەیویست دیدەنیەک لە حوکومەتی کوردستان بکا و چاوی بە «شێخ مەحمود» بکەوێ؛ بۆ ئەوە بە کۆششی هەر دوولایان کوردستانی گەورە لەسەر بناغەیەکی ڕێکوپێک دابمەزرێنن. ئەم نیازەی هەبوو، بەڵام لەبەر شەڕ و شۆڕ، هاتنەکەی بۆ ڕێ نەئەکەوت. هەر لە ساڵی ١٩٢٢ەوە بڕیاری تەواوی دا و خۆی ئامادەی چوون کرد، ئەو ساڵەش هەر بۆی ڕێ نەکەوت.

لەئاخر و ئۆخری ساڵی ١٩٢٢دا لەسەر سنوورەکانی تورکیا، ئێران و عێراق بوو، لەبەرئەوە کە «مستەفا کەمال» ئاڵا بوو بە شەڕی «یۆنان»ەوە، نەیئەویست لەلایەکی ترەوە ئاگر بۆ خۆی هەڵگیرسێنێ، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەمە مێچکە مێچکی لەبەر هەموو کەسێکا ئەکرد، بە تایبەتی سمایلئاغا. ئەم زمان شیرینییە وای لە «سمایلئاغا» کرد کە لەم ئاخرەدا ئەویش خۆی لە تورک نەگەیەنێ.

«سمکۆ» لەو سەر سنوورانە هەرجارە لە داروەستەی شۆڕشگێڕەکانی تری عێراق ئەچوون و چاویان پێی ئەکەوت، ناو و ناوبانگ و هێزیشی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ئەکرد. ئەم دەنگانە هەمووی ئەکەوتنەوە بەر گوێی «مستەفا کەمال» و تورک خواکان، مستەفا کەمال ئەو مەترسیەی کە هەیبوو لە «سمکۆ»، سەیری کرد هەر لەزیادیە و ئەگەر بەمجۆرە لێی بگەڕێ لەوانەیە ئاگری ئەم، لەم ڕۆژهەڵاتەیەوە گەلێ بەتینتر ئەبێ لە ئاگرەکەی «یۆنان» کە لەڕۆژئاوایەوە هەڵیانگیرساندەوە. سمکۆ ـ یش بێ ئاگابوو لەناو دڵی «مستەفا کەمال»، بەڵکو هەر وا چووبووە دڵییەوە کە مستەفا کەمال دۆستی ئێستە و پاشەڕۆژیەتی؛ لەبەرئەمە پاڵی لێ دابووەوە.

«سمکۆ» لە شیرین خەوا بوو؛ خەوی بێ ئاگایی لەناو دڵی مستەفا کەمال و خەوی ڕاستەقینە!. لە ناکاو شەو لە ناوکاێک لەلایەن هێزی «مستەفا کەمال»ەوە شەبەیخوونی کرایە سەر و درایە بەر شێلکی تفەنگ. لەم شەبەیخوونەدا زیانێکی گەورە ڕووی کردە «سمایلئاغا»؛ گەلێک لە پیاو ماقووڵەکانی و یەکێک لەژنەکانی کوژران، خەزنەی پارەکەی تاڵان کرا و «خەمرەو»ی کوڕ ـ یشی بە دیل گیرا. خۆی و ئەوانەی کە مابوونەوە و بە هەر جۆر بوو ڕزگاریان بوو، لەو ناوچەیە کشانەوە و خۆی گەیاندە وڵاتی «ڕەواندز» و لەوێدا سەقامگیر بوو.

لەپاش ماوەیەک لەساڵی ١٩٢٣دا خەبەری نارد بۆ «شێخ مەحمود» کە ئەیەوێ بچێت بۆ دیدەنی. شێخ مەحمود ـ یش هاتنی سمایلئاغا و چاوپێکەتنی سمایلئاغا لەو ڕۆژانەدا پێ خۆش بوو؛ حوکومەتەکەی بۆ ئەو میواندریە ئەمادە کرد.

لە شوباتی ١٩٢٣دا سمایلئاغا بە خۆی و لە شکرێکی ڕازاوەوە گەیشتە ناوشاری سولەیمانی و لەلایەن حوکومەتی کوردستانەوە پێشوازیەکی شاهانە کرا، شادی ئاهەنگی ئەو ڕۆژەی شاری سولەیمانی بۆ هاتنی پێشڕەوێکی میللی وەکو «سمایلئاغا»، یەکێک بوو لە ڕۆژە هەرە میللیەکانی مێژووی ئەوشارە. ئەو ماوەیە کە لە سولەیمانی بوو، میوانی حوکومەتی «شێخ مەحمود» بوو، لەهەموو ڕوویەکەوە قسەیان لەبناغە قایمکردن و پەرەسەندنی حوکومەتی

کوردستانەوە کرد. «سمایل ئاغا» فیکری هاتە سەئەوەکە ئەویش بە کوردەواری، ئێران ئیشێکی وا بکا هەر دوولایان بین بەیەک؛ بەڵام هەندێ ناگوزری لە ناو دەستە و دایەرەی حوکومەتی «شێخ مەحمود» دا چاوپێکەوت، بازگەشت بووەوە لەو فیکرەی و جۆری حوکومەت دارییەکەی «شێخ مەحمود»ی بەتەواوی نەچووە دڵەوە، کەوتە سەر ئەو باوەڕە کە حوکومەت داریی نابێ وا بکرێ.

تەنانەت لەو سەردەمەدا کە لەوێ بوو، هەندێ کردەوەی «شێخ قادر»ی سوپاسالاری بەلاوە باش نەبوو، لە باوەڕی ئەوا کردەوەکانی ئەو زیانی بوو بۆ حوکومەتی «شێخ مەحمود». بەڵکو ئەو کردەوانە و یاسای حوکومەت و حوکومەت داریی زۆر لێک دوور بوون. بە «شێخ مەحمود» ئەڵێ:

«تۆ ئەگەر ئەتەوێ حوکومەت داریی بکەی؛ ئەبێ ئەو سوپاسالارەت بکوژیت، چونکە بوونی ئەو لەگەڵ ئامانجی تۆدا ڕێ ناکەوێ. دیسان درووستکردنی حوکومەت و سیاسەت، چاو لەهەموو براوخزمێک ئەپۆشێ. تۆ ئەبێ یا خزم و برا و کەس و کارت بوێ، یائەبێ حوکومەت و حوکومەدارییت بوێ؛ لە حوکومەتدارییدا هەرکەس هات و بوو بە مایەی سەرنەکەوتن و پێش نەکەوتنت، تۆ ئەبێ ئەوکەسە بکوژی با برا و خزمیشت بێ.»

ئەمە قسەی ئەو «سمایل ئاغا»یە بوو کە بێجگە لەتفەنگ هیچ قوتابخانە و دانشگایەکی نەبینیبوو. نەوەک هەر ئەوەندە بەڵکو خەتی ڕەش و سپی لەیەک نەئەکردەوە، لەگەڵ ئەوشا جۆرە قسانێکی وەها لەعالەمی سیاسەتا لەریزەی قسە هەرەگەورە سیاسیەکانی عالەما دائەنرێ.

لەپاش ئەوە کە چەند ڕۆژێک لە سولەیمانی مایەوە، لەبەرئەو ئاژاوەیە کە کەوتبووە سولەیمانیەوە و ئینگلیز بە «بەیانامە» و هەڕەشە کردن تۆزی تیا ئەکرد، لە ١٦ی شوباتی ١٩٢٣دا شاری سولەیمانی و خەڵکی سولەیمانی بەکۆڵێ سوپاسەوە بەجێهێشت و ڕووبەری وڵاتی خۆی بووەوە. لەو ماوەیەدا کە لە سولەیمانی بوو، چ لەلایەن حوکومەتی «شێخ مەحمود»ەوە، چ لەلایەن خەڵکی سولەیمانیەوە خزمەتێکی جوان کرابوو، هەرجارە «سمایل ئاغا» خۆی لەهەموو کۆڕێکا باسی ئەو خزمەتانەی سولەیمانی ئەکرد و لەگەڵ ئەوەشا دەردە دڵی لەهەندێ لە پیاوەکانی «شێخ مەحمود» بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری حوکومەت ئەکرد.

* * *

«سمایل ئاغا» لە ئێرانا بەتەواوی ناوبانگی بڵاو ببووەوە، لەولاوە ناوی چووبوو بۆ تەورێز و «ئازەربایجان»، لەملاوە بۆ «شیراز» و «تاران»، ئێجگاریش بەوە زەنەقی «عەجەم» و تورکمانەکانی بردبوو کە بەسەرکەسیانا نەئەچوو، هەر کەسی دەست ئەکەوت ئەیکوشت، لەوانە نەبوو یەکێ لەدەستی ڕزگاری بێ. تەنانەت ئەمە یەکێکە لە قسە و کردەوەکانی «سمایل ئاغا» کە عەجەمەکانی ریز ئەکرد و ئەیوت: «بزانم گوللەم تا کوێ بڕ ئەکا.» لەم سەرەوە تفەنگێکی تێ ئەگرتن و بۆ ئەو سەر و پاشان سەری ئەبڕین و کەللە سەرەکانیانی بەسەر یەکا کۆمەڵ ئەکرد و سەیرێکی ئەکردن و ئەیوت: «هێشتا خوێنی جەوهەر ئاغا وەرنەگیراوەتەوە، خوێنی «جەوهەر ئاغا» وەختێک

وەرگیراوەتەوە کە وڵاتی کورد سەربەخۆ بێ و لەمانە پاک بکرێتەوە.*

ئەم کارەساتانە کە لەگەڵ حوکومەتی ئێرانا ئەینواند، لەگەڵ حوکومەتی تورکیا ـ ش ئەیکرد و هەمووجار پەلاماری خاکی تورکیا ـ شی ئەدا، تورکەکانیش لەشکریان لێ ئەکرد، کە ئەیزانی زۆری بۆ دێت خۆی ئەهاویشتەوە وڵاتی کوردەواری ئێران و لەو وڵاتە پان و فراوانەدا کە ـ دایگرتبوو ـ رایئەبوارد.

لە ١٩٢١دا رۆژنامەیەکی کوردی بەناوی «کورد»ەوە لەشاری «ورمێ» دەرکرد و لەم رۆژنامەیەدا کارەساتەکانی خۆی و ئەو وڵاتانەی تیا ئەنووسرا کە ئەو دەستی بەسەراگرتوون، لەگەڵ ئەمەشا هەموو جۆرە هاڵ و هواڵێکی دەرەوە و حوکومەمەتەکانیشی تیا ئەنووسرا. بەم رۆژنامەیە «سمایل ئاغا» بە تەواوی دەنگی کوردایەتی لەو وڵاتانەدا بڵاوئەکردەوە و مەبەستی

---

*ـ بەتایبەتی ئەوشتەش کە «سمایل ئاغا»ی فێری ئەم خوێنڕشتنە کردبوو، کردەوە ناشیرینەکانی حوکومەتی ئێران بوو لە گەڵیا کە بە ئاشکرا و پەنامەکی ئەیانویست بەهەر جۆر بووە لەناوی بەرن.

لەو دەورانەدا کە هەر جارە حوکومەتی ئێران لەشکری ئەناردە سەری هیچ چارێکی پێ نەئەکرا. جارێک حاکمی «ورمێ» «سندوق»ێکی زەرق و بەرقی جوانی بەدیاری بۆ ئەنێرێ و قاپی دۆستایەتی لەگەڵ ئەکاتەوە... «سمایل ئاغا» لە کوێستان ئەبێ. لەناو چیمەن و سەوزەڵانیدا دەوار هەڵدراوە و لە دیواخانا دانیشتووە. لەو کاتەدا کابرای راسپێر بە خۆی و قاقەزی «حاکم» و سندوقە دیارییەکەوە ئەگا و سندوق لەناوەڕاستی دیواخانا دائەنێ و قاقەزەکەشی ئەداتە دەست.

«خەسرەو»ی کوڕی سمایل ئاغا لەو سەردەمەدا منداڵ ئەبێ و لەتەمەنی چوار پێنج ساڵانا ئەبێ و لەدیواخان لەتەنیشت باوکیەوە دانیشتوە. کە چاوی بە «سندوق» ئەکەوێ بەلایەوە شتێکی جوان و زەرق و بەرق ئەبێ؛ بۆی ئەشنێ و ئەگاتە سەری. سندوقەکە ئەمدیو و ئەودیو ئەکا؛ کوتوپڕ «سندوق» ئەتەقێتەوە؛ توەمس ئەمە ناوەکەی هەموو پڕیەتی لە دانەمیت.

«سمایل ئاغا» هەر ئەوەی پێ ئەکرێ پەلامار ئەدا و خۆی ئەخا بەسەر خەسرەوا. کە سندوقەکەش ئەتەقێتەوە «دانەمیت»ەکانی بەو ناوەدا بڵاو ئەبنەوە و گەلێ کەس لە دانیشتووانی دیواخانەکە ئەگرێتەوە ئەیانکوژێ. تەنانەت یەکێ لە کوژراوەکان برایەکی تری «سمایل ئاغا» خۆی بوو لەو شوێنەدا. ئەوەندە هەیە خۆی و «خەسرەو»ی کوڕی رزگاریان ئەبێ و بەرناکەون. پاش ئەم کارەساتە وەڵام ئەنێری بۆ حاکمی «تەورێز» کە کارەساتێکی وائەوماوە و داوای ئەو کەسانەیان لێ ئەکا کە ئەم نیشە ناشیرینەیان لەگەڵ کردووە. حاکمی «تەورێز»یش بۆ ئەوە خۆی لەژێر ئۆباڵی ئەم کردەوەیە دەرکا، شەش حەو کەس لە کاربەدەستانی «ورمێ»ی بۆ ئەنێرێ.

«سمایل ئاغا» کە ئەمانە وەرئەگرێ، ئەیانێرێتە سەر لوتکەی شاخێکی هەزار بە هەزار و لەوێ فڕێیان ئەدەنە خوارەوە، هەپرون بە هەپرون ئەبن.

جائیتر بەهۆی ئەم کردەوانەوە ئەویش کەوتە سەر ئەو خوێنڕێژیە لە «عەجەم»ەکان و هیچ جۆر درێغی لێ نەئەکردن.

شۆڕشی خۆی لە عالەم تێ ئەگەیاند.

لەدەوروبەری ساڵانی ١٩٢٢دا حوکومەتی ئێران ـکە «ڕەزاخان» وەزیری جەنگی بوو ـ خۆی کۆ کردەوە و «مەلیک‌زادە» ناوی بە هەزار کەسەوە ناردە سەری لە وڵاتی «ورمێ»، ئەمانە هەموو جۆرە چەکێکی ڕێک‌وپێکیان پێ بوو. «سمایل‌ئاغا» بەرەنگاریان بوو، شکاندنی، ٧٠٠ کەسی لێ گرتن سەری بڕین. بەم ئیشەی ئەوی زات بوو لەزاتی ئێرانییەکانا نەما، ناوی «سمایل‌ئاغا» بهێنرایە لەهەر دەستە سەربازێک لەشوێنەکەی خۆیانا وشک ئەبوون و توانای شەڕیان نەئەما.

«خاڵۆ قوربان» و «میرزاکوچک خان» هەبوو لەوڵاتی «ئەردەبێڵ» و «پشتکۆ». ئەمانە هەریەکە لە شوێنی خۆیان ناو و ناوبانگێک و دەورێکیان ئەگێڕا، لەو وڵاتانەدا ئەوانیش هەر لە پاش شەڕی گەورە حوکومەتی ئێرانیان بۆ ماوەیەکی زۆر هێنابووە تەنگ، «میرزاکوچک خان» لە خەتی سنووری «قەوقاز»ەوە ئێرانی شڵەژاندبوو، خاڵۆ قوربان ـ یش لەخەتی ڕەشت و گیلان و پشتکۆوە، دەورە دەرخشانەکەی «ڕەزاخان» لەو دەورانەدا ئەوە بوو کە کردبەکاریێ لە ئاخرا ئەمانەی ڕاکێشا بۆ لای خۆی و، خاڵۆ قوربانی هان دا بۆ ئەوە بچێ بەگژ «سمایل ئاغا» دا و لەناوی بەرێ.

لەساڵانی ١٩٢١ ـ ١٩٢٢ «خاڵۆ قوربان» بە نیازی لەناوبردنی سمایل‌ئاغا بە لەشکرێکی کۆکی عەشایرەوە ڕوو بە وڵاتی «سمایل‌ئاغا» بە ڕێ کەوت. کە ئەم خەبەرە گەیشت بە سمایل‌ئاغا، ئەمیش خۆی کۆ کردەوە و چوو بە پیریەوە، لەو شوێنە کە پێی ئەڵێن «حاجی حەسەن» تووشی یەک بوون، لە پاش شەڕێکی مەردانە «خاڵۆقوربان» شکا و لەشکرەکەی، ئەوی لەدەست سەربڕین ڕزگاریان بوو بەرەودوا بوونەوە و ئیتر جارێکی کە ئەو جۆرە لەشکرانە ڕوویان نەکردەوە بە وڵاتی «سمایل‌ئاغا» دا.

* * *

شەڕی ١٩١٤ ـ ١٩١٨ هەموو دنیای تێک شڵەژاندبوو، وڵاتی ئێران ڕێبازی، ڕوس و تورک و ئەڵمان و ئینگیز بوو، لەژێر پێدا پلیشابووەوە، حوکومەتی قاجار لە ئێران هەر ناوی مابوو. «ڕەزاخانی پەهلەوی» لە ئێران هەڵکەوت؛ لە ئێرانێکی بێ نرخی ئەو دەورە، لە ١٩٢٠دا «تاران»ی گرت، وەختێ ئەو تارانی گرت لەهەموو سوچێکی ئێرانەوە بڵێسەی ئاژاوە بوو، لە ١٩٢٣ بوو بە ـ ڕەئیسی وزرای ئێران ـ لە ١٩٢٤دا «ئەحمەدشا» ـ ئاخر پادشای قاجار ـ لەسەر تەختی ئێران هێنرایە خوارەوە، لە ١٩٢٥دا «ڕەزاخان» بوو بە شای ئێران و بوو بە «ڕەزاشا».

لە ڕۆژی دوایی هاتنی شەڕی گەورەدا «ڕەزاشا» بەو ناوەوە کە ئەفسەرێک بوو لەنەیروی ئێران، هەمووجار گوێی لە کارەساتەکانی سمایل‌ئاغای «سمکۆ» ئەبوو کە لە وڵاتەکانی ڕۆژئاوا و شیمالی ڕۆژئاوای ئێرانا ئەیگێڕا، بەڵام هیچی بەرانبەر پێ نەئەکرا، لەم ڕووەوە «ڕەزاشا» ترسێکی لێ پەیدا کردبوو. لە پاش ئەوە کە «سمکۆ» بەشەڕوشۆڕ چار نەئەکرا، چەند جارێک ویستی لەگەڵی بکەوێتە قسە، ئەم هەر خۆی نەئەدا بەدەستەوە. لە ئاخرا بەرجۆرە لەگەڵی ڕێک کەوت کە

لەسەر کانییەک هەیە لە «شاروێران»، «ڕەزاشا» بێت و «سمکۆ»یش بچێتە ئەوێ پێکەوە دوو بە دوو دەستبکەن بە قسەکردن.

لە ١٩٢٤دا «ڕەزاشا» هات و ئەمیش چوو لەو شوێنەکەوتنە قسەکردن، مەرجیشیان ئەوەبوو کە هیچیان هێزێکی وایان لەگەڵ نەبێ. قسەکرنەکەشیان ئەوە بوو گۆیا ئەو بەشی وڵاتی کوردەواریە بۆ «سمایل‌ئاغا» بێت و، بەشی «فارس» و «تورکمان»ەکەش بۆ ڕەزاشا و حوکومەتی ئێران بێ و، ئیتر سمکۆ واز بێنێت. ئەمجۆرە قسانەش زمانلووسی پیاوە ئێرانییەکان بوو، هەر جارە لەگەڵ کوردەکان ئەیانکرد. سا لەوێدا هەر قسەیەک کرا، کرا و هەر یەکە گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان.

لە قسەکانی «سمایل‌ئاغا»یە؛ کە لە پاشا گێڕابوویەوە وتبووی:

«من لەژیانما لەکەس نەترساوم، بەڵام کە چاوم بە «ڕەزاشا» کەوت پشتم هاتە لەرزین. من هەلم بۆ هەڵکەوت ئەوم نەکوشت و هەلم لەدەست بەردا، بەلاّم لەئاخرا ئەو من ئەکوژێ.»

لەو سەردەمانە داکە لە خاکی «تورکیا» بوو، لەعەینی وەختیشا نزیک بوو بە سنووری ئێرانەوە، لەشۆڕشەکانی ١٩٢٥ ـ ١٩٣٠ی کوردەکانی تورکیا بە تەواوی ئاگادار بوو، تازەش ئەو شۆڕشە دەستی پێ‌کردبوو، واتە هەر لە ساڵی ١٩٢٥دا بوو، هەستا «کەمال فەوزی» ناوی نارد بۆ لای قونسولی روس لە «ورمێ» وتی: «ئەوا کوردەکان لە تورکیادا شۆڕشیان ناوەتەوە. ئەوان لەم ڕووەوە چی ئەڵێن؟.» قونسولی ـ یش وەڵامەکەی بۆ ناردەوە کە ئەوان لەم شۆڕشەدا بە هەڵەچوون و هیچیان بۆ ناکرێ.*

«سمایل‌ئاغا» بەمجۆرە لەوڵاتەکانی ئێران و تورکیادا ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی ئەسەند و هێزی زیادی ئەکرد. لەولاشەوە حوکومەتی ئێران و «ڕەزاشا» هەتا ئەهاتن بەهێزتر ئەبوون و عەشایرەکانی وڵاتی «ئێران»ی لەناو ئەبرد، حوکومەتی تورکیا ـ ش عەینی چەشن دەوری عوسمانی نەمابوو، دەوری «کەمال ئەتاتورک» بوو، بەهەر دوولایانەوە ڕقیان لە «سمایل‌ئاغا» هەستابوو، هەر یەکە لایەکەوە ئەیویست سەربەخۆ لەناوی بەرێ، ئینگلیز ـ یش لەوڵاتی عێراق لەوان خراپتر سیاسەتەکەی شتێکی تری ئەویست.

«سمایل‌ئاغا» لەناو ئەم هەموو ئاگرانە دا خۆی ئەپاراست و بەڵکو شان و شەوکەتی خۆی هەر زیاد ئەکرد. لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٦دا لەخەتی «پەسوێ»وە هاتە عێراقەوە و ڕەواندزی داگیر کرد و تیایادانیشت. «سەیدتەها ـ ی شەمدینان» بەهەموو جۆر لەگەڵی بوو، لەگەڵ عەشایرەکانی

---

* - وا دەرئەکەوێ ئەم خەبەرەی ـ سمایل‌ئاغا بۆ قونسولی ورمێ ـ لەبەرئەوە بووە کە بزانێ ئایا روسەکان پشتیوانی ئەو شۆڕشە ئەکەن یان نە؟. ئەگەر نەیکەن ئەم نەتوانێ لەسەر ئیشی خۆی بڕواو دڵنیا ئەبێ لەوە کە مادام روس پشتیوانی ئەولا ناکا. ئەم سەر ئەکەوێ.

دیسان ئەمەش دەرئەکەوێ کە روسەکان لەو سەردەمەشدا پشتیوانی هیچ جۆرە بزووتنەوەیەکی کوردییان نەکردووە.

ئەو وڵاتانەدا هەموو ڕێکەوتن و بوون بە یەک قسە، حوکومەتی عێراق دەستی لەو ناوانەدا بڕا. هەرچەندە لەشکر و تەیروی ئەنارد، بەشی ئەویش وەکو بەشی لەشکرەکانی ئێرانی لێهات.

لێرەدا ئینگیز کەوتە خۆی و ئەویش دایەپاڵ حوکومەتی عێراقی، لەپاش شەڕ و هەرا و کوشتارێکی زۆر، لە مایسی ١٩٢٨ دا «سمایل ئاغا» ناچار کرا بەوە کە بچێتە خاکی تورکیا، لەوێش حوکومەتی تورکی بە هەموو هێزێکیەوە بەرەنگاری بوو، هەرچەندە حوکومەتی عێراق و ئینگلیز بە هەمووجۆر سەری ڕێیان پێ گرتبوو، لەگەڵ ئەوەشا هەر لەعەینی ساڵاگەڕایەوە بۆ عێراق و ناوچەکانی پێشووی داگیر کردەوە!.

«مەندوبی سامی» بەغدا سەیری کرد ئەگەر «سمایل ئاغا» بەمجۆرە لەسەر ئیش بڕوا، ئارەزووەکانی ئەو و تەونەکانی هەموو تێک ئەچن!. ئەمجا هێنای حوکومەتی عێراقی هەڵخڕان بۆ ئەوە کە لەگەڵ حوکومەتی ئێرانا قۆڵ بکەن بە قۆڵی یەکا بۆ لەناو بردنی «سمایل ئاغا»!. لەعەینی وەختا ئەمانەی هەموو کرد و هەر دوو حوکومەتەکە بەجارێ کەوتنە پەلاماردانی سمکۆ، «سمکۆ» لەپاش شەڕێکی زۆر دیسان گەڕایەوە بۆ خاکی تورکیا.

لەپاش ماوەیەک سەیری کرد کاروباری ئەو و ئامانجی ئەو بەوجۆرە درووست نابێ کەهەر وا بەبێ دەنگ لە خاکی تورکیادا دانیشێت. ئەگەر مەبەستیش شەڕکردنە، شەڕ ئابێ لەسەر شتێک بکرێ کە بەرێکی هەبێ. لەبەرئەمە هەستا لەوێشەوە گەڕایەوە بۆ وڵاتی ئێران؛ بۆ ئەو شوێنەی کە دوورە لەسنوورەکانی عێراق و تورکیاوە. بەمجۆرە لەو وڵاتەدا لێی دانیشت و حوکومەتی «ڕەزاشا»یش هەر کۆششێکی ئەکرد بۆ لەناوبردنی؛ بە هیچ دەرنەچوو.

حوکومەتی ئێران کە زانی لەڕێی دوژمنایەتیەوە هیچی پێ لەگەڵ ناکرێ، ئەمجا هێنای بینای دۆستایەتی و خۆشەویستی لەگەڵ دامەزراند و کەوتە قسەی خەرش کردن لەگەڵیا. بەمجۆرە «سمایل ئاغا»ی هێدی کردەوە، تا کەوتە ساڵی ١٩٣٠، لەنیسانی ئەو ساڵەدا بانگهێشتنێکی ماقوڵانەی بەناوی دۆستایەتییەوە لە شاری «شنۆ» بۆ کرد. سمایل ئاغا ـ ش بەهەموو دڵێکی دۆستایەتییەوە بەچەند سوارێکی کەمەوە چوو بۆ سەربانگهێشتنەکەی.

ئەمەش گۆیا بەوناوەوە کە دیسان «ڕەزاشا» ئەیەوێ چاوی پێی بکەوێ و «هەندێ قسەوباس هەیە پێکەوە بیکەن، چەپەری ئەم دەستە گوڵەش «عەمەرخانی شەرەفی» بوو ـ کە ئامۆزای سمایل ئاغا بوو، «سمایل ئاغا» بڕوای پێنەکرد، کە ئەچن بۆ سەربانگهێشتن «سەرهەنگ سادق خان» ـ کە ئامرفەوجی شنۆ ئەبێ ـ دێت ئەڵێ: «شا نەیتوانی بێت، من لەباتی ئەو هاتووم و میوانداریی بەجێ دێنم»!.

شوێنی بانگهێشتن و میوانداریی لەقشڵەی حوکومەت بوو، کە «سمکۆ» گەیشتە ناوشار، بە پیریەوە چوونێکی ڕەسمی لەلایەن حوکومەتەوە بۆ کرا و دوو ڕۆژ میوان حوکومەت بوو. «سمایل ئاغا» ئاگای لێی نییە کە تەونی بۆ تەنراوەتەوە!. ڕۆژی سێیەم ئەیەوێ بگەڕێتەوە، نەوجێکی عەسکەر خۆیان بەدەورەی کۆشکەکەدا حەشار ئەدەن. لەو وەختەدا کە «سمایل ئاغا»

خەریکی نانخواردنی میوانداریی نیوەڕۆی حوکومەتی «ئێران» ئەبێ، پاشان هەڵئەستێ و بگەڕێتەوە، «سەرهەنگ سادق خان» دەست ئەخاتە ناو دەستی و بەجووتە دێنە دەرەوەوە و ئەگەنە سەر پرد و شیوەکە، سەرهەنگ دەستی خۆی ڕائەوەشێنێ لەدەستی. لەگەڵ دەست راوەشاندن، فەوجەعەسکەر لەناکاو دائەبارن و بەبێ پشوو دەستڕێژێکی بەسەرا ئەکەن و «سمایل ئاغا» و پیاوەکانی ـ تەنها دوو کەسیان نەبن ـ لەو شوێنەدا ئەکوژرێن!. قسەکەی خۆی هاتە دی لەگەڵ رەزا شا ـ داکە وتی: «من ئەوم نەکوشت، بەڵام ئەو من ئەکوژێ!.».

حوکومەتی «ئێران» گەلێ میوانداری وای بۆ کوردەکان کردووە!. «جەوهەر ئاغا»ی برایشی هەر بەوجۆرە لە «تەورێز» میوانداریی بۆ کرا!.

ئیتر بە لەناچوونی «سمایل ئاغا» شۆڕش و کۆششی چەند ساڵەشی لەناو چوو، ئەو ئاواتەی کە هەیبوو، بردیە ژێر گڵ!. ئەوەندە هەبوو دەنگی بڵێسەی شۆڕشەکەی وەنەبێ هەر لەو کوانووەی کوردەوارییەدا بووبێت، بەڵکو دەنگەکە لەدەری کوانووەکە و لەپاش ئەو دەورەش بەهۆی رۆژنامەکانی بێگانەوە هەر ئەهات و ناوی ئەو شۆڕشەکەوتە سەر گەلێ لاپەرەی کتێب و داستانان و لەمەوە شۆڕشێکی گەلێ فیکری کەوتە مێشکی زۆر لە کوردەکانەوە!.

# شۆڕشی سابلاّخ

شەهیدی ئازادی کورد
[قازی محەمەد]
(١٨٩٣ز - ١٩٤٧ز)

وەکو لەشوێنەکانی تری ئەم کتێبەدا بۆمان دەرکەوت لەدوای دوایی هاتنی شەڕی ١٩١٤ - ١٩١٨ بیروباوەڕێکی تر کەوتە دنیاوە، کۆنگرە سیاسیەکان و پەیمانەکانی «سیڤەر» جۆرەشتێکی تریان بەمەردم پیشان ئەدا؛ ئەوان ئەوەیان پیشان ئەدا کە هەمور قەومێک ئەبێ بە بەشی خۆی بگاو لە دیلی دەرچێ، بەتایبەتی قەومی کورد ئەم دەهۆڵەی بۆ لێ ئەدرا!. کە شەڕی گەورەی دووەمیش هاتە پێشەوە، شەڕی ١٩٣٩ - ١٩٤٥ بە پەیمانی «ئەتلەسی» ئەو دەنگ و ئاوازەیە بە شەیپورێکی تر دیسان بلاّو کرایەوە!.

هەر کە جەنگی پێشوو دوایی هات، قەومی کورد لەهەمورولایەکەوە کەوتە شوێنی دەنگەکە و ماوەبەماوە لەهەر سوچێکەوە پێشوازی وەرگرتنی ئەو حەقەیان ئەکرد. بەتەییەعەت ئەم باوەڕە لە ولاّتی «سابلاّخ» بە پوختی بلاّو بیووەوە؛ لە پالّەوانەکانی شەڕی پێشوو حوکمەتەکانی ئینگلیز، روس، ئەلّەمان و عوسمانی بوون. روس و عوسمانی هاو سنووری «سابلاّخ» بوون، ئەلّەمان و ئینگلیزیش بەهۆی دووەکەی ترەوە نەوەک هەر لەولاّتی سابلاّخ بەلّکو لەهەمرو خاکی ئێرانا گەمە و گالّتەیان ئەکردا.

پاش کشانەوەی ئەوانە هەر یەکە بۆ ولاّتی خۆیان - بەتاوا - شۆڕشەکانی «سمایل ئاغای سمکۆ» لە رەگ و ریشەی سابلاّخ و ولاّتەکانی تەرگەوڕ و مەرگەوڕ و سندوس - دا، لەگەلّ

شۆڕشەکانی [شێخ مەحمود] لە ولاّتی سولەیمانی، ئەم دووانە ئەوەندەی تر گوێچکەی ولاّتی سابلاّخیان ئەزرنگاندەوە بەوە کە ئەمانە سەربەخۆیی کوردیان ئەوێ؛ ئەمانە هەموو ئەوەمان پیشان ئەدەن کە گەلاّڵەی بیروباوەڕێک لە ولاّتی سابلاّخا هەر لەدەمێکەوە بووە.

کە شەڕی دووەم هات بەسەرا، لەبەرئەوە ولاّتی کوردەواری نەوتی هەبوو؛ ئەو نەوتە کە نەبوونەکەی پشتی ئەڵەمانی دابە زەویا، بوو بە چاوەندازی گەلێ لە حوکومەتە گەورەکان، هەر یەکە لەم رووەوە بە جیا ئەیویست گەمە و گاڵتە و شۆخی لەگەڵ کورد و کوردەواری دابکا!.

دیسان هەر بەهۆی شەڕەوە لەملاو لەولاوە ئینگلیز و روس رژابوونە ئێرانەوە، دۆست بوون بۆ ئەوە ئەڵەمان لەناو بەرن، بەلاّم لە پەنامەکیشا هەر دۆست بوون؟!. ئەمە «لۆرانس» و «ئەسداف» ئەیزانن، کە لۆرانس لەلایەن ئینگلیزەوە و «ئەسداف» لەلایەن روسەوە بەناوی کاروباری سیاسەت و بازرگانییەوە بە ولاّتەکانی کوردەواری ئێرانا ئەگەڕان و هەریەکەیان بە بێ‌دەنگی ئەویکەیان کوردەکانیان بە بارێکا را ئەکێشا!!. کوردیش لەبەر دڵسافی خۆی، یا لەبەر ناچاری خۆی، دڵی ئەچوو لەدەنگی خۆش و شوێنی ئەکەوت!.

ئەم دڵسافی و ناچاریە بووە، کە لە هەموو رۆژ و لاپەڕەیەکی کوردا تووشی ئەوەی کردوون کە بکەونە شوێن دەنگی دەهوڵ!. نەوەک ئەوە کە دوژمنەکانی کورد ئەڵێن: کورد پارەپەرەست و بێگانەپەرەستە، پارەپەرەست نییە چونکە وەنەبێ لەو دوژمنانە پارەپەرەستتربێ؛ دوژمنەکانی کورد بۆ پارە هەر شتێکیان هەیە و نییە ئەیدۆڕێنن، کورد لەسەر شەرەف و هەنەناتی قەومیی خۆی، خۆی ئەدا بەکوشت، نەوەک ئەیفرۆشێ بە پارە. بێگانە پەرستیەکەیان رەنگبێ راستبێ، بەلاّم ئەمەش لەبەر دڵپاکی و لەبەر ناچاریە بە ئەڵهای قەومیەتەوە، ئەو بێگانانە خراپن کە ئەوەندە درۆ لەگەڵ کورد ئەکەن، نەوەک کورد خراپە کە بەهۆی دڵپاکیانەوە بەگوێی ئەوان ئەکەن. تا ئێستە وابووە بەلاّم لە ئێستە بەدواوە پێویستە کورد خەبەری ببێتەوە و ئیتر بەگوێی کەس نەکا و کۆششی خۆی بۆ خۆی بێ.

لەبەر دووشت بەگوێی کەس نەکا؛ یەکەم لەبەرئەوە تا ئێستە کە شوێن تەمووورەی خەڵک کەوتووە هیچی نەبەستۆتەوە، با ماوەیەکیش شوێن دەنگی خۆی بکەوێ بزانێ لەم دەرگایەوە چی ئەبێ؟. دووەم با ئەو شوورەییە کە دوژمنەکانی پێوەی ئەنووسێنن و ئەڵێن بێگانە پەرستە، با ئەو پەردەیەش لادا بزانین ئەو وەختە ئەو دوژمنانە چی تر ئەگرن بەدەستەوە بۆ لەکەدار کردنی کورد؟!.

* * *

ئەو دەنگی ئازادی و سەربەخۆییە کە لە لێواری دیواری دوو شەڕی ١٩١٤ ـ ١٩١٨ و ١٩٣٩ ـ ١٩٤٥ەوە بەرز ئەبووەوە و بەر گوێچکەی کورد ئەکەوت، هەینی دەنگیش بوو بەر گوێچکەی ئازەربایجان و ولاّتی «ئازەربایجان» ئەکەوت. بە تایبەتی لەشەڕی دووەما گوێچکەی ئەوان زیاتر

ئەزرنگێنرایەوە، چونکە ئەوان بەبێ پەردە سنووریان نووسا بوو بە سنووری روسیاوە، بۆ دەست خستنی نەوتیش دیاریەکی باش بووا. ئەمە و خۆیشیان هەر لەگەڵێ زووترەوە هەستیان بە شتێک کردبوو، بۆیە لەدەورەکانی «قاجاری» دا تەورێز پایتەختی «وەلیەعهد» بوو. بۆیە لەدەورەی [رەزاشا]دا هەموو دەمێک تەورێز و وڵاتی [تەورێز] لە چەوساندنەوە دابوون و لەژێر ئەو چاوێریە دابوون کە نەوەک لەژێر فەرمانی [تاران] دەرچن و حەوملیون کەسی [ئازەربایجان]ی بگەن بەسەربەخۆیی!.

ئەو سەردەمە کە نەیروەکانی ـ ئینگلیز و روس ـ چوویوونە ئێرانەوە ئەو مەرجەیان دابوو کە لەگەڵ دوایی هاتنی جەنگا، هەر دوولا وڵاتی ئێران بە جێ بێڵن. شەڕ وردە وردە خەریکە دوایی دێت، تاکی ترازووی سوێندخوارەکان خەریکە قورس ئەبێ. هەر دوو نەیرو لەدڵا ناتوانن دانکەنی نەوتی ئەو وڵاتە بین، لە رواڵەتیشا پێیان ناکرێ نەچنە دەرەوە چونکە پەیمان لە بەینایە، ئەم بەو ئەڵێ بچورە دەرەوە و ئەویش بەم ئەڵێ بچورە دەرەوە!... لەبەرئەمە پێویستە هەریەکەیان بە ناوی شتێکەوە پێ دابگرن!. شتیش لەوە چاکتر دەست ناکەوێ کە دەنگی ئازادی و سەربەخۆیی قەومەکانی ئەو وڵاتە بڵاو بکرێتەوە!..

«ئیبراهیم حەکیمی ـ حەکیمولمولک» سەرۆکی وزارەتی ئێران و«جەنەراڵ ئەرفەع» سەرۆکی ئەرکانی جەنگ بوون، ئەگەر هەرجۆرە بەندوباوێک لەو وڵاتانەدا بڵاو بکرێتەوە، وەنەبێ ئەوان بتوانن بەر هەڵستی بکەن، ئێران نەخۆش بوو، [حەکیمولمولک] نەخۆشتر بووا. ئەڵێم نەخۆش بوو بەرانبەر بەو شەڕانە و بەو کیشوەرانە، ئەگینا خوا هەڵ ناگرێ لەو رۆژانەدا «اسد عَلی وفی الحروب نعامة!.»، یا:

«شیراند پیش پشە و شغالاند پیش شیرا». ئەم شتانە و ئەم هۆیانە بێجگە لە هۆیە تایبەتیەکانی تر ـ کردیانە کارێ کە لەولاتەکانی ئازەربایجان و سابلاخا سەرلەنوێ دەنگێکی تر پەیدا ببێتەوە، بەڵام ئەنجامی دەنگەکە ئەبێ بە قازانجی کێ؟. ئەوە مەبەستی ئەیپوورچیەکە نییە!. پەندێکی کوردی هەیە ئەڵێ: «پارەی کفن دەستکەوێ مردو گۆڕ بەگۆڕ!..».

لەهەموو وڵاتی کوردەواری دا نەوت هەیە، هەموو عالەم چاوی لە نەوتە، نەوت و کوردیش یەکێکە، نەوت دەستکەوێ کورد هەرشتێکی بەسەردێت با بێت!! .

* * *

«سابلاخ» کە پێی ئەڵێن «مەهاباد»، کەوتۆتە وڵاتی موکریان و لەرۆژاوای خاکی ئێرانایە، پاڵی داوە بە[ئازەربایجان]ەوە و نزیکە بەوڵاتی روسیاوە، لە دووشاییشەوە کیشوەرەکانی عێراق و تورکیایە، رووبارێکی لە پاڵایە، هەر چوار دەوری کێوە و بوون بە شوورەی شارەکە؛ هەر لە دەورێکی کۆنەوە بەهۆی سنوورەوە شوێنی هەراو هوریا و ئاژاوە و شۆڕش بووە.

دانیشتوانی [سابلاخ] بە زەوق و دڵتەڕن، بە تایبەتی سەرچارەی ئاهەنگ، و نەقامەکانی

کوردییە.

بەرەی قازیانی [سابلاَخ] زۆر لە مێژە ناو و ناوبانگیان لە دڵی خەڵکی سابلاَخ و وڵاتی موکریدا جێی خۆی کردۆتەوە، وەکو بەرەی «تورجانی»یەکان ئەوانیش ئەو ناو و ناوبانگەیان بەوجۆرە هەر هەبووە.

وڵاتی کوردەواری پابەندی دیانەت و ئاشنای مەلایانی زانا و دانا بوون، دەستەی ـ مەلا و عولەما ـ لە هەموو وڵاتی کوردەواری پایەیەکیان هەبووە. «قازی محەمەد» پایە و مەرکەزی باوباپیری و زانایی و زمانزانی و دەستڕۆیشتوویی خۆیشی ئەمانە هەموو پاڵیان پێوەنا کە پیاوێکی بەڕێز بێ لە وڵاتی سابلاَخا. دیسان «قازی عەلی» باوکی ـ کە کوڕی میرزا قاسمی کوڕی میرزا ئەحمەدی کوڕی میرزا قاسمی گەورە بوو ـ ئەویش لە پێشا شوێن ئاگردانێکی بۆ «قازی محەمەدی کوڕی» دامەزراندبوو. بەتایبەتی کە «قازی عەلی» لە ١٩٣٨ کۆچی کرد و قەزاوەت و فتوا گەڕایەوە بۆ سەر «قازی محەمەد»، ئەوەندەی تر پایەی بەرزبووەوە.

لە ٢٥ی ئاغستۆزی ١٩٤١ کە لەشکری ئینگلیز و ڕوس لەملاولەولاوە چوونە ئێرانەوە، ئێران لەهەموو لایەکەوە کزیی و بێهێزیی ڕووی تێکرد، «ڕەزاشا» گیرا و برا بۆ وڵاتان.

لە عێراقا حیزبی «هیوا» هەبوو، ئەم حیزبە پەل و پۆیەکی باشی بڵاوکردبووەوە و ناو و ناوبانگی بۆ هەمولایەکی کوردەواری ڕۆیشتبوو. ئەم حیزبە حزبێکی کوردی بوو، لە ئەفسەران و سەرۆکی عەشایر و قوتابیان و خوێندەواران چووبوونە ناوەیەوە؛ لە ساڵانی ١٩٤٢ ـ ١٩٤٣ میرحاج ـ کە ئەفسەرێک و یەکێک بوو لە ئەندامە بەکارەکانی (هیوا) ـ بەناوی گەڕان و دیدەنیەوە چوو بۆ وڵاتی موکریان بۆ ئەوە بتوانێ تیشکی هیوا بخاتە ئەوێشەوە، هەرجارە کە ئەچوو بۆێ و بەرامەیەکی وای بەرچاو ئەکەوت کە بتوانێ ڕاستە و ڕاست کوانگەیەک بۆ ئەم حیزبە پەیدا بکات.

هەندێ لە گەنجەکانی ئەو وڵاتە ـ کە تا بیست کەسێک ئەبوون ـ لە «سابلاَخ» بە ناوی «کۆمەڵەی.ژ.ک»ەوە دەستیان دابوو بە ئیشەوە و گۆڤارێکیشیان بەو ناوەوە دەرئەکرد. گۆڤارەکە ئەبرا لە «تەورێز» لە چاپ ئەدرا و لە وڵاتی موکریان بڵاو ئەکرایەوە. ئامانجی کۆمەڵەی.ژ.ک ئەوە بوو کە ژیانی کوردستانی گەورە بێ•. «میرحاج» لە جاری دوایی‌دا خۆی گەیاند بە ئەندامانی ئەم

---

•- سەرچاوە و بناغەی دامەزراتی ئەم حیزبەش لە پێشا ئەگەڕێتە بۆ ئازایەتی «مەلای داودی». ئەم مەلای داودیە پیاوێکی بیر ڕووناکی جەربەزە بوو، دووکانێکی بچکۆلەی بەقاڵیی هەبوو لە شاری سابلاَخ کردبووی بە دەستمایەی ژیانی، خەڵک و خوا و گەنجان هات و چۆی دووکانەکەیان ئەکرد. لەو دووکانە بچکۆلەیەدا [مەلای داودی] بیروباوەڕی ڕووناک ئەکردەوە و وەکو قسەکردنی گوێ ئاگردان دەرسی داستانی کوردایەتی دائەدان. لەمەوە بەرەبەرە توانی قسەکردنەکانی بخاتە شکڵێکی ڕێکوپێکەوە

کۆمەڵەیە و داوای ئەوەی لێکردن کە دەستی یارمەتی بۆ بەجێهێنانی ئامانجەکانی خۆی بۆ درێژ کەن، ئەندامانی کۆمەڵە بەجۆرێک هاتنە پێشەوە کە بەهەموو ئاشکرابیەک لەیەک تێگەیشتن و لقی حیزبی «هیوا» لەو ولاتەدا دامەزرا.

کۆمەڵەی «ژ.ک» بەرەبەرە پەرەی سەند و دەستیان کرد بەبلاوکردنەوەی نهێنیەکانی دڵی خۆیان و پروپاگاندە کردن بۆ رزگار کردنی کوردستانی گەورە. کۆمەڵە پەرەی سەند و زیاد بوو، تیپ تیپ خەڵک ئەهاتنە ناویەوە، وای لێهات پێویستی کەوت بەوە کە سەرۆکێکی دڵسۆزی ناوداری هەبێ. باوەڕی کۆمەڵە هاتە سەرئەوە کە «قازی محەمەد» شایانی ئەم سەرۆکیەی هەیە.

قازی کرا بە سەرۆک، هەر بەوە کە ئەو بوو بەسەرۆک، کۆمەڵە ئەوەندەی تر پشتیوانی بۆ پەیدابوو. مەلاکانی ولاتی موکری لەم رووەوە خزمەتێکی گەورەیان کرد، هەر مەلایەک لە گوندەکەی خۆی ئیشێکی وای ئەکرد ئەگەر یەکێک نەچێتە ناو ئەو کۆمەڵە «ژ.ک»ەوە ـ کەوا خزمەتی کوردایەتی و رزگاربوونی کورد ئەکا ـ ئەمە بە گوناحبارییەکی گەورە ئەژمێرێ.

* * *

روسەکان لەولاوە ناوچەی «ئازەربایجان»ی ئێرانیان داگیرکردبوو و بەهەمو جۆر دەستیان خستبووە کاروباری ئەو ولاتەوە. حوکومەتی ئێران لەگیانەلادا بوو، «جەعفەر پیشەوەری» ـ

---

و بۆیەکی تری بەسەرا بێنێت. تا وای لێکرد خستیە قاڵبی حیزبێکەوە و ناوی نا حیزبی «ژ.ک» و هەموو ئەندامانی حیزب تا ١٢ کەسێک ئەچوون.

پاشان «عەزیزی زەند» هەبوو، هەتا بڵێیت بە کار و گورج و گۆڵ بوو لەو رۆژەدا بۆ ئیشی کوردایەتی، ئەویش خۆی لە [حیزب] نزیک کردەوە و دەستی تێخست و وردە وردە خۆی کرد بە خاوەن و سەرۆکی ئەو کۆمەڵە. لە ئاخرا عەزیز ئەم کۆمەڵەیە هەندێکی راکێشا و دەستەیەکی تریشی پەیدا کرد، ئەمانەی لەژێر چوار چێوەی ناوی «حیزبی ئازاد بخوای کوردستان» دا رێکخست.

«عەزیز» زۆر ئیش لێهاتوو بوو. رۆژ بە رۆژ دام و دەزگای حیزبەکەی خۆی زیاتر ئەکرد، لەمەوە ناوی دەرکرد و وای لێهات ناسرا، بێگانەکان ـ بە تایبەتی حوکومەتی ئێران ـ بەچاوێکی سەیرەوە سەیریان ئەکرد. بەرەبەرە حوکومەتی ئێران رایکێشا بۆلای خۆی و بەرزی کردەوە. لەئاخری کارا بەهۆی ئەوەوە، گەلێ لیستەی ئەم «حیزب»ە کەوتە دەست حوکومەتی ئێران و کەوتە گرتنی ئەندامانی ئەم حیزبە! عەزیز ـ یش بە تەواوی خۆی بوو بە پیاوێکی پیاوانی «ئێران»!.

ئیتر پاش ئەم کارەساتە نرخێکی لەلای پاشماوەکانی حیزب نەما و هەموو بڕوای خۆیانیان لێ وەرگرتەوە و بەڵکو بە چاوی پیاوێکی گزی کەرەوە سەیر ئەکرا.

لەپاش ئەو «حسەین فروهەر» لە پایەی سەرۆکی حیزبایەتیا شوێنی عەزیزی گرتەوە و کاروباری کۆمەڵە ئیتر لەژێر چاوێری ئەوا ئەرۆیشت. بەلام هەر بەجۆرێکی بێدەنگی، تا رۆژگاری «ئێران» گۆڕا و جەنگی دووەم بەتەواوی کەوتە ناوەوە.

پیاوێکی به دیمەن بوو له وڵاتی [ئازەربایجان] ـ روسەکان بەهەموو جۆر یاریەیان دا، حیزبێکی دیموکراتی له وڵاتی ئازەربایجان دامەزراند و کەوتە سەرجیا کردنەوە و سەربەخۆیی ئازەربایجان!.

لەملاشەوە کۆمەڵەی «ژ.ک» ناوێکی پەیدا کرد و بە پەرەسەندنێکی تەواو پەرەی سەند. ناوی «قازی» کەوتە دیواخانە سیاسیەکانەوە، بەهەموو جۆر هات و چۆ لە بەینی «تەورێز» و «سابلاخ» دا پەیدا بوو. ئەفسەران و پیاوانی روس لە تەورێز ـ شوێنی پیشەوەری ـ هەر زۆر زۆر کەوتنە ناوەوە.

لەم هات و چووانەدا «پیشەوەری» دەنگی بەرز بوونەوەی کۆمەڵەی [ژ.ک]ی کوردی لەم بن دەستەوە بۆ خۆی بەزیان هاتە بەرچاو ئەگەر لەگەڵی نەبێ!. لەم کارەساتە روسەکان تێگەیشتن. ئەمجا «قازی»یان بەسەرۆکی لیژنەیەک لە «عەلی رەیحانی» و «قاسمی حاجی بایزئاغا» و چەند کەسێکی تر بە بانگهێشتن بانگ کرد بۆ «باکۆ» بۆلای «جەعفەر باگرۆف». لیژنە لە تشرینی دووەمی ١٩٤٥دا چوو بۆ [باکۆ] و لەگەڵ [جەعفەر باگرۆف] لەماوەی مانەوەی حەفتەیەکدا لەوێ هەموو جۆرە قسە و باسێکیان بڕیەوە بڕیار وادرا کە کۆمەڵەی «ژ.ک» ببێ بە «دیموکراتی کوردستان» و لەگەڵ حیزبی دیموکراتی پیشەوەریدا بۆ وەرگرتنی هەقی خۆیان ببن بە هاودەنگ.

لەپاش گەڕانەوەی لیژنە بۆ [سابلاخ]، هەموو ئەهلی شار و سەرۆکی عەشایرەکان و حەشاماتی وڵاتی موکریان بە بانگهێشتنێکی رەسمی لە ئاخری تشرینی دووەمی ١٩٤٥دا بانگ کرد و لەو کۆمەڵەدا کۆمەڵەی «ژ.ک» ناونرایە «کۆمەڵەی دیموکراتی کوردستان».

ئەم ناوە و ئەم دەنگە لەهەموو ئەو وڵاتانەدا بڵاو بووەوە و وردە وردە عەشایرەکانی ئەو ناوە وەکو پورەی هەنگ لەدەرەوی ـ قازی و سابلاخ ـ کۆبوونەوە و هیوایەکی گەلێ بەرز کەوتە ناو کوردەوە. بە تایبەتی دەستەی [مەلا مستەفای بەرزانی] و بەرزانییەکان ـ کە روویان کردبووە سابلاخ ـ ئەوەندەی تر هیوا و ئومێدی دابوو بە هەموولایەک. بەهەر دوولاوە بەرەبەرە خەریکی بڵاوکردنەوەی دەنگی کورد و سەربەخۆیی کوردبوون لەوڵاتەکانی «موکریان» و «بانە» و «سەقز» و «فەیزوڵلا بەگی»دا.

لەو رۆژانەدا چوونی «مەلا» و بەرزانییەکان بۆ ئێران، بێجگە لەوە کە هێزێکی گەورەبوون بۆ حوکومەتی کوردستان، ترسێکیشی خستە سیاسەتی تارانەوە!.

چونکە لەولاوە [ئازەربایجان] و لەملاوە سابلاخ لەم کاتەدا سەریان راست کردۆتەوە و ئەیانەوێ خۆیان لە حوکومەتی [تاران] دابپچڕن، گومانی تێدانییە کە چوونی [مەلامستەفا] لەم وەختە ناهەموارەدا ـ بەرانبەر بە تاران ـ شل و شێواوییەک پەیدا ئەکا. حوکومەتی «تاران» بۆ گیرسانەوەی ئەم لێشاوە چارێکی نەدۆزیەوە ئەوە نەبێ کە بنووسێ بۆ ـ ئامر فەوجی ـ سەردەشت «سەرهەنگ پزیشکیان» بەهەر جۆر بێت مەلا پەشیمان بکاتەوە لەوە کە پاڵ بدا بە حوکومەتی

[سابلاخ]ەوە!.

«پزیشکیان» بەهۆی «مام عەزیزی قەرەنیاغای مامش»ەوە دەمی گەیشت بە مەلا و گەلێ شتی بۆ هەڵڕشت؛ لەوشتانە: کە ئەمانە ئێستە بەرانبەر بە ئێران بێگانەن و حوکومەتی [ئێران] بەناوی پەنا بەرانی سیاسیەوە ئەتوانێ داڵدەی ئەمان بدا و زەوی و زاریان بداتێ و مەلا خۆیشی لە تاران «نائیب»ێک بێت و هەموو دەم لە پارلەمان و لەگەڵ وەزیرەکان و «شا» دابێ!. حوکومەت ئەمانەی لەگەڵ ئەکا و ئیتر ئەویش واز بێنێ لەوەکە بداتە پاڵ حوکومەتی سابلاخ!.

دیارە «مەلا» ئەمانەی نەچوو بە گوێچکەدا و بە پێچەوانەی ئامانە ڕۆیشت و خۆی گەیاندە قازی و شاری سابلاخ. چوونی پیاو و لەشکرێکی وا پڕچەک لەوختێکی وادا، گومانی تێدا نابێ کە هێزێکی مەعنەوی هەرە گەورە ئەبێ بۆ ئەوکەسانە کە ئەیانەوێ حوکومەتێکی کۆرپە و تازە درووست بکەن.

● ● ●

ڕۆژەکانی ئەو وڵاتە هەرجارە پەردەیەکی تری پیشان ئەدا، لەناو ئەم پەردە ڕەنگاوڕەنگانەدا کورت‌وبڕ لە ١١ی کانونی یەکەمی ١٩٤٥دا «جەعفەر پیشەوەری» لە تەورێز جمهوریەتی ئازەربایجانی بلاوکردەوە و ئەوەی دەربڕی کە وڵاتی «ئازەربایجان» لە حوکومەتی «تاران» و ئێران جیابووەوە و لەو ڕۆژە بەدواوە خۆی سەربەخۆ ئەژی!.

لەگەڵ بلاوکردنەوەی ئەم ئاگاداریەدا هەموو وڵاتی «ئازەربایجان»یان لە نەیرو وکاربەدەستانی حوکومەتی [تاران] پاک کردەوە، مایەوە سەر شاری «ورمێ» کە «ئەحمەد زەنگنە» ئامر فەوجی ئەوێ هەتا بەینێک شاری نەدا بەدەستەوە، پاشان ئەویش بەهۆی عەشایرە کوردەکانی ئەو دەورە و ئەهلی [ورمێ] خۆیشیەوە گیرا و «ئەحمەد زەنگنە»ش خرایە ژێر محاکمە و لێپرسینەوەوە.

لەو سەردەمانەدا کە «پیشەوەری» جمهوریەتی ئازەربایجانی بلاوکردەوە، لەملاوە «قازی محەمەد» لیژنەیەکی بە سەرۆکی «محەمەد حسەینی سەیف‌قازی» ناردبوو بۆ [تورێز] بۆ ئەوە هەر دوولا لە بەینی یەکا ڕێکەون و بە پشتیوانی یەک، دەستی حوکومەتی [تاران] لەو ناوەدا ببڕن.

پاش بڕانەوەی قسەوباسی [سەیفی قازی] لە تەورێز، لە ١٢ی کانونی یەکەمی ١٩٤٥دا کۆبوونەوەیەکی زۆر گەورە لە سەرۆکی عەشایرەکان و ئەهلی ناوشار و قوتابیانی قوتابخانەکان لەناو شاری سابلاخ کراو «قازی محەمەد» بلاوی کردەوە کەوا لەم تەئریخە بەدواوە وڵاتی «سابلاخ» و کوردەواری لە حوکومەتی [تاران] جیابووەوە و لەئێستەبەدواوە ئیملاتی سەربەخۆیی کرد.

لە ڕۆژی ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٤٥دا بەیداخی حوکومەتی [تاران ] لەسەر دایەرەکان هێنرایە خوارەوە و لەناو چەپڵەڕێزانی مەردما بەیداخی کوردستان - ی لەشوێن دانرا و ئاڵای کوردستانی پیرۆز هەڵکرا. دروشمی ئاڵاکەش بەمجۆرە بوو:

سەرەتا پارچەیەکی سوور، پاش ئەو سپی کەبەئەندازەی چوار ئەوەندەی سوورەکە، پاش ئەو سەوز بەئەندازەی بەشێ لە چوار بەشی سپیەکە. لەناوەڕاستی پارچە سپیەکەدا نیو کورە رۆژێک؛ بەسەر رۆژەکەوە قەڵەمێک، لەملاو لەولای رۆژەکەوە دوو گوڵە گەنم بەرەنگی زەرد؛ لەسەراوردی هەموانەوە بەشکڵی چەنبەر نووسرابوو «دەوڵەتی جمهوری کوردستان».

ئەم دەنگە بەمجۆرە لەهەموو ولاتەکانا بڵاوبووەوە و تەنانەت دیواخانە سیاسیەکانی دەرەوەشی گرتەوە، لەهەموو کون و قوشبێکی ولاتی کوردستانی ئەو ولاتەوە، پۆل پۆل خەڵکی روویان ئەکردە «سابلاخ» و دیدەنی دەوری تازەی کوردستان!.

پێشەوا [قازی محەمەد]

لە ناو دروشمی سەرەک

کۆماریدا

کە ئەندامانی کۆمەڵە و هات و چۆکەرانی ژێر ئاڵای تازە تەماشایان کرد سەردەمی ئەوە هاتووە کە [جمهوریەتی کوردستان] بە جۆرێکی رەسمی بڵاوکەنەوە، لە ٢٦ی کانونی یەکەمی ١٩٤٥دا لە پاش کۆبوونەوەی هەموو ئەهلی سابلاخ و سەرۆک عەشرەتەکانی ولاتی موکری و [قەیزوڵلا بەگ]ی و ئەو ناوە، «قازی محەمەد» بە جۆرێکی رەسمیی لەناو دنیایەکی خۆشی و شادمانیدا «جمهوریەتی کوردستان»ی بڵاوکردەوە.

پاش ئەوە «محەمەد حسەینی سەیف قازی» بە جل و بەرگی ژەنەراڵیەوە لە شوێنێکی بەرزا رووبەری خەڵکەکە ناوی [پێشەوا و سەرۆکی جمهوریەتی کوردستان]ی بۆ قازی محەمەد بڵاوکردەوە؛ ئەمجا پێشەواش بە جل و بەرگی ژەنەراڵی و بەناوی سەرۆکی هەموو هێزی کوردستانەوە لە شوێنێکی بەرزا سوپاسگوزاری ئەم باوەڕ و بەراتەی خەڵکی کرد، سەربازان و قوتابیانی کورد نمایشێکیان لەبەردەمی پێشەوا و خەڵکەکەدا نواند و ئەوی پێویستی رەسمیاتی دروستکردنی حکومەتێکی تازە بێت؛ بەجێیان هێنا. ئەمجا «قازی محەمەد»ی پێشەوا بەمجۆرەی خوارەوە وەزارەتی کوردستانی دروستکرد و ئەندامی بۆ هەموو وەزارەتێک بەمجۆرە دانا:

١ـ سەرۆک وەزیر: حاجی بابە شێخی جەمیان.
٢ـ وەزیری جەنگ: محەمەد حسەینی سەیفی قازی.
٣ـ وەزیری پۆست و تەلگراف: کەریم ئەحمەدی.
٤ـ وەزیری فەرهەنگ: مەناف کەریمی.
٥ـ وەزیری کیشوەر: محەمەد ئەمین موعینی.
٦ـ وەزیر تەگبیر ـ مشاور: حاجی رەحمانی ئێلخانیزادە.

٧ـ وەزیری ڕێگەوبان: ئیسماعیل ئیلْخانیزادە.
٨ـ وەزیری ئابووری: ئەحمەد ئیلاهی.
٩ـ وەزیری بازرگانی: حاجی مستەفای داودی.
١٠ـ وەزیری کشتوکاڵ: مەحمودی وەلیزادە.
١١ـ وەزیری کاروفەرمان: خەلیل خەسرەوی.
١٢ـ وەزیری پڕوپاگاندە: سدیق حەیدەری.

The Cabinet and other officials, Mahabad, February 1946

هەندێ لەوەزیرەکانی حوکومەتی کوردستانی «قازی محەممەد»:
دانیشتوانی ناوەڕاست «پێشەوا قازی محەممەد».
لەلای ڕاستەوە بۆ چەپ:
[مستەفا داودی، خەلیل خەسرەوی، ئەحمەد ئیلاهی، محەممەد ئەمین مرعیتی، بلووریان، ئیلْخانیزادە، کەریم ئەحمەدی، میرزا عەلی ڕەیحانی].
ریزی دواوە: ئەفسەران و نووسەرانی ڕۆژنامە.

لە ڕۆژی ١٤ی کانونی دووەمی ١٩٤٦دا کۆبوونەوەیەک کرا بۆ ئەوە کە «پێشەوا» سوێندی سەرۆک کۆماریی بخوا، ـ کە ئەمە شتێکی قانونی و ڕەسمیە لەهەموو نیزامێکی کۆماری و پادشایەتیدا. [پێشەوا] فەرمانی دا بە ئەندامانی کۆمیتەی مەرکەزی کە قورئانی پیرۆز و دروشمی ئاڵای کوردستان ئامادە بکرێ. ئەندامانی کۆمیتە و وەزیرەکان یەک لە شوێنی یەک کەوتنە پشت سەری «قورئان» و «ئاڵا»کە ـ کە بەدەست مەلا حسەینەوە بوو ـ تا چوونە ژووری پێشەوا، پێشەوا

هەستا و بەدەستی خۆی سەرپۆشەکەی لەسەر «قورئان» و ئاڵاکە لادا و ئەم سوێندەی خوارەوەی خوارد:

«سوێند ئەخۆم بە خوا و بە قورئانی پیرۆز و بە نیشتمان و شەرافەتی قەومی کورد و بە ئاڵای پڕ لە «ئیفتیخار»ی کورد، تا دوایی هەناسەی ژیانم و تادوا تنۆکی خوێنم بە گیان و بە ماڵ لە رێگەی مانەوەی ئازادی کورد و بەرزکردنەوە و پایەداری ئاڵای پڕ لە ئیفتیخاری کورددا کۆشش بکەم و دوا نەکەوم و بە سەرۆکی کۆماری کوردستان و یەک گرتنی کورد و ئازەربایجان ئیفتیخار ئەکەم و کۆشش ئەکەم بۆ مانەوەی ئەم ئامانجە!.»

***

کۆماری کیشوەری کوردستان بەمجۆرە درووست بوو، هەموو کوردەکان بە بەرزانییەکانەوە روویان کردە ئەم کیشوەرە، دەنگی ئاوازی گەیشتە پارلەمانە سیاسیەکان، رۆژنامە نووسەکانی بێگانە بەهەموو جۆر بۆ وەرگرتنی باس و خواس روویان تێکرد.

لە پێش ئەم تەئریخە و لە پاش ئەم تەئریخەش هێزی کوردی کەوتە داگیرکردنی ئەو وڵاتە کوردەواریانەی کە لەژێر فەرمانی تارانابوون. لەو ناوەدا سەربازی ئێران لە «میاندواو» و هەندێ پۆلیسی ئێرانی لە «بۆکان» مابوونەوە؛ بۆکان هەر دەمێک بوو لە هێزی ئێران پاک کرابەوە، ئابڵوقەی «میاندواو»یشیان دا، ئامرفەوجی میاندواو «عەقید موستەشاری» لە ئاخرا کە تێگەیشت بەرانبەری پێناکرێ، خۆی و شاری دا بەدەستەوە و داوای ئەوەی کرد لە حوکومەتی کوردستان کە رێگەی بدەن بڕوا و شار بەجێبێڵێ. ئەمانیش رێگەیان دا و لە رێگەی «هەوشار»ەوە رۆیشت و وڵاتی میاندواو لە ١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦دا بە تەواوی لەژێر حوکمی تارانا دەرچوو.

لەملاشەوە روویان کردە «سەردەشت» دەورەیان دا، رێگەی هات و چۆی نەیروی ئێرانی بەینی «سەردەشت» و «بانە»یان بڕی، لە جنوبی رۆژهەڵاتەوە هێزی نەیروی کورد گەیشتە «سەقز»، رێی هات و چۆی هێزی ئێرانی بەینی «بانە» و «سەقز»یشیان بڕی. بەکردنی ئەم ئیشانە مەعنای وابوو هەموو ناوچەکانی کوردەواری ئەو وڵاتە کەوتە ژێر فەرمانی حوکومەتی کوردستانەوە و فەرمانی حوکومەتی [تاران] نرخێکی لەو ناوەدا نەما.

هەر سەربازێکی حوکومەتی ئێران کە لەو ناوچانەدا هەبوو، بەهەموو جۆر لەلایەن هێزی کوردییەوە ئابڵوقە دران و رێگەی رزگاربوونیان بڕا. ئەم سەرکەوتنی لەسەر یەک و پەرەسەندنی هێزی کوردییە، حوکومەتی ئێرانی خستەسەر ئەو باوەڕە کە زۆری پێ ناچێ ئەمانە پەلاماری «سنە» و «کرماشان» ئەدەن و بەڵکو هەموو رۆژئاوای ئێران دائەگرن!. لەراستیشدا ئەو بینەی کە ئەمان پێیانەوە نابوو؛ ئەو ئارەزوووەی بەجێ ئەهێنا.

بە تایبەتی لەناوچەکانی «سەقز ـ بۆکان» و «بۆکان ـ میاندواو»ەوە بەهەموو چەشنە ئیش کردنێک ئیش ئەکرا. وەکو ئەوە لە ٣٠ی نیسانی ١٩٤٦دا حوکومەتی ئێران هێزێکی گەورەی

سوارە و پیادەی بەهەموو جۆرە چەکێکەوە نارد بۆ رزگارکردنی ئەو هێزانەی کە لە شیمالی سەقز ـەوە لەلایەن نەیروی کوردیـەوە ئابلۆقە درابوون. ئەمانەش ئەبوایە بچوونایە بۆ «قارەوا» و «ئالتون ـ ی سەرو». لێرەدا هێزی بەرزانی، [قادرخانی] و «فەیزوڵلابەگی» لێیان راپەڕین و «قارەوا» و هەموو دەوروبەریان گرت. ١٨ سەرباز و ئەفسەریان لێ بریندارکردن، ٤٩ کەسیان لێ کوشتن و چەک و تالانێکی زۆریشیان دەستکەوت. ئەم شەڕە تا ١٢ی مایس درێژەی کێشا.

لە خەتی «ئالتون»ی سەروەوە روو بە رێگەی «بانە» دیسان هێزی [بەرزان] ئەو ناوەشیان گرت و بەریان لە ئێرانییەکان بڕیەوە. لەلای «بۆکان»یشەوە هێزێکی کوردی باش ئەوناوەی داگیر کردبوو. «عەمەرخانی شەریفی»ش لە قۆڵی «تەموتە»وە جادەی بەینی «سەقز» و «بانە»ی داگیرکردبوو. دەستەیەکی‌تریش خەتی بەینی «بۆکان ـ میاندواو»یان گرتبوو. لەلای «سەردەشت»یشەوە عەشایری هەرکی، گەورک و کلاّسی ئەو ناوەیان گرتبوو.

بەمجۆرە ئەم ولاّتانە هێزی حوکومەتی ئێرانیان تیا کز کرابوو، هێزی کوردی بەوەرگرتنی فەرمان لە «سابلاّخ»ەوە هەنگاو بە هەنگاو تیایا ئەبزووتنەوە.

ئەو هێزە ئێرانیانە کە لە «میرەدێ» و «بانە» و «سەردەشت» دابوون و لەلایەن هێزی کوردی‌یەوە دەورە درابوون، لەلایەن گوزەران و رابواردنەوە حاڵێکی شڕیان هەبوو، چونکە ئەمانە لە «سەقز»ەوە مانگانە و شتومەکیان بۆ ئەهات، رێگەی [سەقز] لەمانە هەمرو گیرابوو. قیادەی ئێران لە [سەقز] ویستی هێرشێک بکا و خەتی خۆی لەو شوێنانە بەرەڵا بکات، بە تایبەتی خەتی بەینی «سەقز ـ سەردەشت» ـ کە ئەم شوێنە بە تەواوی شپرزە بوو ـ

لە ١٦ی مایسی ١٩٤٦دا پێنجسەد سەرباز بەهەموو جۆرە چەک و جبەخانەیەکەوە پەلاماری گردی «سەییدە گردە»ی دا ـ کە ئەم گردە تەنها ٨ سەربازی کوردی لێ بوو؛ لە پاش سەعات و نیوێک شەڕ، هێزی ئێران بە شکانێکی خراپ شکانا! ئەم شکانە شکانێکی مەعنەوی زۆر ناهەمواری‌دا بە هێزی ئێران؛ سەیر ئەکرا لێرەوە ئەم شکانە ناشیرینە رووبدا، لەلایەکی‌ترەوە بەرزانییەکان و [حەمە رەشیدخان] و شوکاک ئەوا خەریکن رێگەی «دیواندەرە» ئەگرن، «تەموتە» و «هەیەجانان» بە تەواوی کەوتە ژێر حوکمیانەوە، «سەرشیوی سەقز» خەریکە پاک ئەبێتەوە، ئەگەر بەمجۆرە بڕۆن زۆری پێ ناچێ لووت ئەنێن بە مەریوان و هەورامانەوە و «سنە»ش ئەڕوا!.

لەبەرئەمانە قوّاتی ئێرانی بەتەواوی چوار چمکی خۆی کرد بەلادا و خۆی ئامادەی شەڕێکی گەورە کرد. دووهەزار سەربازی پڕچەکی ئەو ناوە بەهۆی هێزی ئاسمانی و تانک و دەبابە و زرێلی و تۆپەوە بەرێ کەوتن بۆ گردی «مامەشا»؛ لەم شوێنەدا «مستەفا خۆشناو» بە ٣٨ سەربازی کوردەوە رەگی خۆی داکوتابوو؛ ئەو هەموو هێزی ئێرانە پەلاماری ئەو دەستەیەی دا، لە ١٧ی مایس دا هەر لە سەر لەبەیانەوە جەنگ گەرم بوو، قوّاتی ئێرانی لەهەموو لایەکەوە سنگی

ئەیهێنایە پێشەوە، فڕۆکە لە ئاسمان و تۆپ و دەبابە لە خوارەوە وەکو بارانی بەهار گوللە و بۆمبایان ئەباراند.

هێزی کوردی بەرانبەر بەم هەموو ئاگرە ئەجەنگی و سنگی کردبوو بەمەتاڵ، شەڕ لەوانە بوو، بوو بەدەستە و یەخە، قیادەی شەڕی «مامەشا» وا هەڵەسووڕێنرا ئێرانییەکان وا تێ ئەگەیشتن کە ئەو هێزی کوردیەی لەگەڵ ئەوان شەڕئەکەن، نابێ کەمتربن لە دووهەزار سەرباز بەهەموو چەکێکەوە، لەگەڵ ئەوەشا ئەمان لە ٣٨ زیاتر نەبوون!.

ئەو رۆژە تا ئێوارێ جەنگێکی دلێرانە کرا و کوشتارێکی زۆر زۆر لە هێزی دوژمن روویدا، رۆژی دوایی جەنگ دەستی پێکردەوە و هەرجارە تاکی تەرازوو بەلایەکا قورس ئەبوو!. لەدەمە و ئێوارەدا ئێرانیەکان خەریکی کشانەوە و گەڕانەوە بوون، کوت و پڕ هەڵەیەک لەدەستەی ئەملا روویدا و ئەو هەڵەیە لە ئاخرا بوو بەهۆی ئەوەکە گردی «مامەشا» بەجێبێڵن!.

راستە گردەکەیان بەجێهێشت و لە شوێنێکی تر سەرنگەریان گرت، بەڵام زیانێک کە ئەوان لەهێزی [ئێران]یان دا و ئازایی و بەجەرگییەک ئەوان لەو شەڕەی [مامەشا]دا نواندیان، هەموو ئەفسەرەکانی ئێرانییان سەرسام کردبوو!. لەپاشا بەهەموو سەر سوڕمانێکەوە شەڕی مامەشا ـ یان باس ئەکرد و نەئەچووە دڵیانەوە کە لەو شەڕەداکەمتر لە دوو هەزارکەس سەری رێی پێگرتبێتن!.

لەم شەڕەدا ٥ کەس لەدەستەی کوردی شەهید کرا، یەکێک لەوان «خۆشەوی خەلیل» بوو کە لەم شەڕەدا برینداربوو و پاشان برایە خەستەخانەی [سابلاخ] و لەوێش چار نەکرا لە ئاخرا مرد و بە کۆبوونەوەیەکی رەسمی لەلایەن حوکومەتەوە تەرمەکەی نێژرا.

کوشتاری هێزی ئێرانی ـ ش گەیشتبووە ئەندازەیەک کە حوکومەت لە [سەقز] مەنعی گەڕانی شەوی کردبوو، یەکێ لەو ئیشانە کە ئەم مەنعەی بۆ کراوە، هێنانەوەی کوژراوەکانی شەڕی «مامەشا»یە، بۆ ئەوە خەڵک نەیانبینێ و لە چاوپێکەوتنی کوشتارێکی وا زۆر ورە بەرنەدەن! وەکو ئەوانەی لەو شەڕەدا بیبوون ئەیانگێڕایەوە لە کەم شوێن وا رێکەوتووە هێزی [ئێران] ئەوەندە کوشتار بدا بەدەستەوە.

* * *

کە ئیش گەیشتە ئەم شوێنە سەر لەشکری ئێران «رەزمئارا» کەوتە سەر ئەوەکە ئیشێکی وا بکا لەگەڵ کوردەکانا دەمیان بگا بەیەک و بەڵکو رێکەوتنێک درووست بکا. بەجۆرێکی رەسمی داوای کرد لە حوکومەتی [سابلاخ] کە چەند کەسێک بەناوی «ممثل»ەوە بنێرێ بۆ [سەقز] بۆ قسەکردن لە کاروباری ئەو ناوەوە.

لە ٢٦ی مایسی ١٩٤٦دا حوکومەتی سابلاخ «عیزەت عەبدولعەزیز، یاوەر ئیبراهیم، یاوەر جەعفەر کەریمی» بەناوی «ممثل»ەوە نارد بۆ سەقز کە لەگەڵ رەزمئارا دا قسە بکەن. رەزمئارا وتی:

«لەبەرئەوە کە [قەوامولسەڵتەنە] و «پیشەوەری» و [سەدری قازی] لەم وەختەدا کەوتوونەتە گوفتوگۆی ئەوە کە کاروفەرمانی وڵاتی ئێران، «ئازەربایجان» و «کوردستان» بەجۆرێکی هێمنی و ئاشتی ببڕێننەوە، پێویستە لەم ناوچاوانەشا شەڕ بووەستێنرێ تا ئەوان ئەگەن بە شوێنێک!».

نێرراوەکانیش ڕەزامەندی خۆیانیان دەربڕی و لەسەر ئەم شتانە خوارەوە رێکەوتن:

(١ـ ئەم نێرراوانە بەناوی حوکومەتی خۆیانەوە، خەبەر بنێرین بۆ ئەو هێزانەیان کەوان لەبەرانبەری هێزی حوکومەتی ئێرانەوە، بۆ ئەوە شەڕ بووەستێنن، وەکو چۆن ئەم فەرمانە ئەکرێتە سەر هێزی ئێرانییەکانیش، شەڕ بووەستێنن تا ئاخر قسەی پێشەوایانی هەر سێ حوکومەت دەرئەکەوێ.

٢ـ بۆ ئەوە هیچ تەنگ‌وچەڵەمەیەک لەبەینی هێزی «ئێرانی» و «کوردی»دا روونەدا، کوردەکان ٤ کیلۆمەتر لەدەوری [سەقز] و سێ کیلۆمەتر لە شیمالی جادەی سەقز ـ سەردەشت بکشێنەوە دواوە و لە رووباری سەقز و «زەرێنەڕوود» نەیەن بەملاوە.

(ممثلەکان وتیان بڕیاردان لەسەر ئەم بەندە لەدەسەڵاتی ئێمەدا نییە، ئەتوانین تا ماوەی ٢٤ سەعات ئەم قسەیە بگەیەنین بە «سابلاغ» بزانین ئەوان بڕیار ئەدەن یان نە؟).

٣ـ نە دەستەی هێزی ئێران، نە هێزی کوردی؛ حەقی ئەوەیان نییە، ئەو هێزانەیان کە ئێستە لەمەیدانی شەڕان و سەنگەرەکانی خۆیانیان گرتووە، پشتیوانیان بکەن و هێزی‌تریان بۆ بنێرن، تا گوفتوگۆی پێشەواکان ئەبڕێتەوە، ئەوەندە هەیە فڕۆکەی ئێرانی ئەتوانێ تا ٤کیلۆمەتری شیمالی «سەقز» و جادەی سەقز ـ سەردەشت بفڕێ، ئەمەش بۆ چاوێری کاروبار نەوەک شتێکی‌تر.

٤ـ بۆ ئەوە کەوا هەر دوولا دڵنیا بن لە بەئەنجام گەیاندنی ئەم پەیمانە، تا گوفتوگۆی پێشەواکان دوایی دێت، سێ کەس لەلایەن حوکومەتی دیموکراتی کوردستانەوە دابنرێت؛ یەکێ لە [سەقز]، یەکێ لە [بانە]، یەکێ لە [سەردەشت] کە ئەمانە لەگەڵ فەرماندەکانی ئێرانا لەو شوێنانەدا ئەگەر تەنگ‌وچەڵەمەیەک لەو ناوچانەدا رووبدا، بیبڕێننەوە.

٥ـ مەفهومی بەندی دووی ئەم پەیمانە بۆ ئەوە جێی خۆی بگرێ، تا رۆژی ٢٨ی مایس درێژ ئەبێتەوە!).

ئەم بەندانە بەمجۆرە لەهەر دوولاوە ئیمزا کرا و تەنانەت لەدەستەی ئازەری ـ ش [ئیبراهیم عەلی‌زادە، خەلیل ئازەرئابادگان و حەسەن جەودەت] لە کۆمیتەکەدا هەبوون، ئەوانیش ئیمزایان کرد.

بەڵام ئایا ئەم پەیمانە کە بەمجۆرە بڕیاری لەسەردرا، بردیان بەڕێوە؟. نە ، نەبرا بەڕێوە!. نەبرا بەڕێوە چونکە «رەزمئارا» لە دانانی ئەم پەیمان و بەندانە مەبەستی ئەوەبوو کوردەکان بکاتە خەو تا خۆی ئیشی خۆی بەتەواوی قایم ئەکا و لەشکرەکانی [سنە] و [کرماشان] ئەگەیەنێتە ئەو

ولآتە، ئەو وەختە کە نەیروەکانی خۆی بەهێز کرد، پەیمان و بەندەکانی پەیمان وەکو خەتی سەر ئاوی لێ دێت!.

کوردەکان لەپاش ماوەیەک کەزانیان ئەمە داوە، [رەزمئارا] بۆی ئاونەتەوە و یەک دوو جار بێ پەیمانیان بە پێی ئەم بەندانە بۆ دەرکەوت، ئەو وەختە ئەمانیش ئیتر بەقۆڵ بەستراوی بۆی دانەنیشتن.

لە پاش ماوەیەک [رەزمئارا] کە سەیری کرد ئیشی بەمجۆرە بۆ ناچێ بەڕێوە، کەوتە سەرئەوە کە لەگەڵ [قازی] خۆیدا بکەوێتە قسەکردن و ئەمجا بەجۆرێکی تر بێتە مەیدانەوە.

لەسەرئەم نیازە دەستی کرد بە راسپاردن بۆ لای [قازی] کە لە شوێنێک یەک بگرن و لەکاروباری ئەو ولآتەوە قسەبکەن. قازی ـ ش لەبەرئەوە کە ئەیەویست ئیش بە خۆشی ببڕێتەوە، خۆی لەچاوپێکەوتن و قسەکردن دوور نەئەخستەوە. بەم هۆیەوە گوندی «سەرا»ی دانا بۆ شوێنی ئەو چاوپێکەوتنە.

لە رۆژی ١٧ی حوزەیرانی ١٩٤٦دا «قازی» خۆی و چەند کەسێک گەیشتنە «سەرا» و لەملاشەوە «رەزمئارا» لە [سەقز]ەوە بە رێ کەوت، سواری جیپێک بوو، کە ئالآی کوردستانی بەسەرەوەبوو، بەهەموو سەربەستیەکەوە خۆی و چەندکەسێک لەعەینی رۆژا گەیشتنە «سەرا» و لەگەڵ قازی ـ دا کەوتنە قسەکردن. ئاخر قسەیان لەسەرئەم شتانە بڕیاریان دا:

(١ـ حوکومەتی کوردستان رای لێ بێ حوکومەتی ئێران لەسەقز ـ ەوە خواردەمەنی و بەرگ بنێرێ بۆ ئەو هێزە ئێرانییانە کە لە [میرەدێ] و [بانە] و [سەردەشت] لەلایەن حوکومەتی کۆمەڵەوە ئابڵوقە دراون، ئەویش بەمەرجێک ئەم شتانە وەختێک دەرباز ئەبن کە لەلایەن هێزی کوردی ـ یەوە بپشکێنرێن و دڵنیا بن لەوە کە هیچ جۆرە چەک و گۆبەندێکی شەڕی تێدا نییە.

٢ـ چەک و شتومەکی جەنگ بۆ ئەو شوێنانە بە هیچ جۆر رێ نادرێ، هەروەها ئەو ئەفسەر و سەربازانە کە لە شوێنە ئابڵوقە دراوەکاندان، نابێ بگۆڕێن، مەگەر نەخۆش، یا بریندارێک نەبێ، ئەوە بگۆڕێن و بردنی ئەوە درووستە.

٣ـ هەر کاروانێکی ئازوخە و جل و بەرگ لەلایەن حوکومەتی ئێرانەوە ئەچێ بۆ ئەو هێزە ئابڵوقە دراوانە، ئەبێ لەپاش پشکنین، پیاوی کۆماری کوردستانی بەرەسمی لەگەڵ بێ.

٤ـ ئەگەر لەشکری ئێران بە پێچەوانەی ئەم بەندانە بزووتەوە، نەیروی کوردی حەقی ئەوەی هەیە بەربەست بکا و نەیەڵێ شتومەک بچێ بۆ ئەو شوێنانە کە ناوبران!).

لە پاش ئەوە کە لەسەر ئەم بەندانە رێکەوتن، قسە هاتە سەر ئەوە کە دووکەس لەلایەن کۆماری کوردستانەوە بەناوی نمایندەوە لەگەڵ [رەزمئارا]دا بچن بۆ [سەقز] و لەوێوە بۆ [بانە] و [سەردەشت]، بۆ ئەوە مەفهومی ئەم بەندانە بەهەر دوو لەشکری ئەو ناوە بگەیەنن.

لەسەرئەم تەگبیرە «حاجی بابەشێخ» و «عەقید نانەوازادە» لەگەڵ رەزمئارا ـ دا بە رێ کەوتن و

هاتن بۆ [سەقز]. لەوێوە هەرسێکیان چوون بۆ [بانە]. بەرزانییەکان لە «قشـلاخی سالح بـەگ» لەژێر فەرماندەیی «میرحاج»دا پێشوازییەکی باشیان کردن. ئەم پێشوازی و خزمەتکردنەی ئەوان ئۆمێدێکی زۆری دا بە [رەزمئارا] بۆ رێکەوتنەکەیان.

ئەم دەستەیە شەوی ١٩ی حوزەیران چوونە «بانە» و لەبەیانیا چوون بۆ «سەردەشت» و ئەوی قسەوباس بوو لەو ناوەدا بەهەر دوو لەشکریان گەیاند و لە رۆژی ٢١دا گەڕانەوە بـۆ «سەرا» و دیسان [رەزمئارا] چاوی بە [قازی محەمەد] کەوتەوە و پاشان ئەو گەڕایەوە بۆ [سەقز] و لەوێوە بۆ «تاران»، بۆ ئەوە ئەم کەین و بەینە لە حوکومەتی تاران بگەیەنێ.

لەم رۆژانەشدا لە قوڵی «مەریوان»ەوە ـ حەمەخانی کوڕی مەحمود خانی کانی سانان بەو نیازە کە خۆی بگەیەنێ بە حوکومەتی کوردستان لەوێوە بۆ وڵاتی کۆمەڵە بە رێ کـەوت، لەرێگـەدا «عەلی بەگی وڵەژێری» ـ کە سەر بەئێرانییەکان بوو ـ سەر رێگەی بەدەستەی [حەمە خان]گرت، دەسـتـەی [حـەمەخان] [عـەلی بـەگ و تـفەنگچیەکـانی ـ عـەلی بەگ]یـان شکـان و بـەڵکو لە «قامیشەڵە»ش دەریان پەڕاندن!.

پاش ئەوە کە [رەزمئارا] و نمایندەکان لە «بانە» و «سەردەشت» گەڕانـەوە و پـاش ئـەوە کـە رێگەکانی ئەو ناوە ـ کە لە وەختی خۆیا هێزی کوردی خراپی کردبوون ـ چاک کرانەوە بـە پـێی پەیمانەکان، حوکومەتی ئێران لە [سەقز]ەوە شـتومەکـی ئـەنارد بـۆ هـێزەکـانی خـۆی کـە لەو ناوەدابوون و ئەم شتومەکانەش لەلایەن کاربەدەستانی کوردەوە ئەپشکێنران.

ماوەیەک بەمجۆرە تێپەڕی، کوت و پڕ جارێک کە کـاروان پشکـێنرا، سـەیریان کـرد، گـەلێ تفەنگ و فیشەک و تۆپێکی تێدایە کە لە [سەقز]ەوە لەلایەن حوکومەتی ئێرانەوە نێرراوە بۆ هێزی [سەردەشت]!. ئەمە پێچەوانەی بەندەکان بوو، لێرەدا کاربەدەستانی کورد ئـەم شـتومەکـانەیان گرت و بە پێی بەندەکان زەوتیان کرد.

بێجگە لەمەش «سەرتیپ ئایرم» کە فەرماندەی [سەردەشت] بوو، ئەویش پەیمانی شکان و پـەلاماری هـێزی کـوردی ئـەو نـاوەی دا!. لەبـەرئەمە هـێزی کـوردی رێگـەی سـەقز ـ بانە ـ سەردەشت ـ یان گرتەوە و نەیانهێشت ئیتر کاروان بێت. لەم وەختـەدا کـاروانـێکی عـەسکەری ئێران ـ کە ٢٤ سەرباز و ئەفـسەرێک بـوون و شـتومەکـی جـەنگییان بـۆ هـێزی [سـەردەشت] هێنابوو ـ کوردەکان بە دیل گرتنیان و هێنایانن بۆ [سابلاخ]. ئیتر لەسـەر ئـەم کـردەوانـە بـەینی حوکومەتی ئێران و حوکومەتی کوردستان تێکچووەوە!.

* * *

ئیش و کار هەتا ئەهات بەلای ئێرانییەکانا رووە و خراپتر ئەڕۆیشت. لەولاوە [ئـازەربایجان] بەوجۆرە دەستی دابوویە و لەملاشەوە حوکومەتی [قازی] هەر ناوچەی حوکمی خۆی بلاوتر ئەکردەوە. «حەکیمولمولک»یش لە تاران پەیتا پەیتا بە فەرمان و بە رادیۆ، رووی ئەکردە هێزەکانی

خۆی کە لەولاوە بگەڕێنەوە بۆ «هەوشار» و لەملاوە بۆ [سەقز]. هەتا ئەو ئەمجۆرە فەرمانانەی بلاوئەکردەوە، هێزی ئازەری و کوردی زیاتر تەنگیان بە نەیروی [ئێران]ی هەڵئەچنی!.

لە ئاخرا چار نەما «حەکیمولمولک» لەوەزارەت لاچوو، «ئەحمەد قەوامولسەڵتەنە» وەزارەتی درووست کرد و دەستی کرد بە ئیشکردن. لەپێش هەموو شتێکا رەئیسی ئەرکانی نەیروی ئێرانی لابرد. قاپی سەریەستی دیموکراتی خستە سەر گازی پشت. ئەو حیزبانە کە داخرابوون ئیجازەی بەهەموویان دایەوە و [ئەحزاب] کەوتنەوە ئیش. لەگەورەکانی «تودە» و شیوعی ـ کە وەزارەتی پێشوو حەپسی کردبوون ـ هەموویانی بەرەڵاکرد. «زیائەدینی تەباتەبائی» و هاوڕێکانی ـ کە ئەمانە سەر بەئینگلیز بوون ـ هەمووی گرتن و لە بەندیخانەی توندکردن!.

لەپاش ئەوە کە ئەمانەی کرد؛ ئەمجا داوای لە پیشەوەری کرد کە هەندێ کەس لەلایەن [ئازەربایجان] و کوردستانەوە بچن بۆ [تاران] بۆ قسەکردن. دەستەی ئازەری لەژێر سەرۆکی پیشەوەری و نێرراوی حوکومەتی قازی ـ ش «محەمەد حسەینخانی سەیفی قازی» بوو، لە ١٠ی نیسانی ١٩٤٦دا چوون بۆ [تاران]، هەزارویەک قسە لەو کۆبوونەوەیەدا کرا و حوکومەتی «قەوام» بناغەی گەلێ وەعدەی داڕشت و بە ئیمڕۆ سبەی ئیش دوا ئەخرا و وەعدەکانیش هیچی نەئەهاتنە ئەنجام!. [موزاهەرە] و هەمهەمە بۆ گەڕانەوەی لیژنە لە [تاران]، لە [ئازەربایجان] و [سابلاخ] دەستپێکرا. لیژنە گەڕانەوە و پەیمانەکان هیچیان بەجێ نەهێنران!.

بەندێکی هەرە زلی ئەو پەیمانە کە لە بەینی قەوام و لیژنەدا قسەی لێوە کرا ئەوەبوو کە [قەوام] وتی:

«دانانی فەرماندەی لەشکر و پۆلیس لە ولاتی [ئازەربایجان]دا بەدەست ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازەربایجان بێت، ئەو ئەنجومەنە کێی دانا، حوکومەتی ئێران بڕیاری لەسەر بدا.!».

کەچی کوتوپڕ لەسەرەتای نیسانا [قەوام] قسەکەی هەڵگێڕایەوە و بەمجۆرەی لێکرد:

«دانانی فەرماندەی نەیرو و پۆلیس لە ئازەربایجان لەدەست حوکومەتی ئێرانایە و ئەو ئەبێ دایینێ، بەلام لەبەرئەوە لیژنە وا تێ نەگەیشتووە و بە بارێکی ترا بۆی چووە، وا ئەو پەیمانە سەری نەگرت و هەڵوەشێنرایەوە!.».

ئەم تەسریحە ناهەموارە لەم وەختەدا کە [قەوام] دەری بڕی، دەنگێکی زۆر ناشیرینی لە ئازەربایجان و کوردستانا دایەوە، بە تایبەتی لە ولاتی کوردەواریدا هەر زۆر پێچەوانەی ئەو مەرامە بوو کە ئەویسترا. لەبەرئەمە «پێشەوا» دەستی کرد بە خۆ کۆ کردنەوە و گەورەکانی ولاتی حوکومەتی کوردستانی کۆ کردەوە و کەوتە قسەی ئەوە کە پەیمانێکی دوو سووچی لەگەڵ [ئازەربایجان]دا ببەستن.

لە ٢٤ی نیسانی ١٩٤٦دا لە کۆشکی مەجلسی میللی ئازەربایجان، سەرانی حوکومەتی ئازەربایجان و کوردستان ـ کۆ بوونەوە و بەناوی دوو کیشوەری سەربەخۆوە پەیمانێکی جەنگی و

ئابووری ـ یان پێکەوە بەست.

ئەندامانی دەستەی حوکومەتی کوردستان بۆ ئەو پەیمانە ئەمانە بوون:

(١) پێشەوا و سەرۆکی حوکومەتی کوردستان [قازی محەمەد]. (٢) ئەندامی کۆمیتەی دیموکراتی کوردستان [سەیدعەبدوڵڵای گەیلانی]. (٣) ئەندامی دیموکراتی کوردستان [عەمەرخانی شەریفی] سەرۆکی عێلی شوکاک. (٤) ئەندامی حیزبی دیموکرات رەشید بەگی جیهانگیری سەرۆکی عێلی هەرکی. (٥) ئەندامی حیزبی دیموکرات زیرۆبەگی بەهادوری. (٦) نمایندەی ولاتی [شنۆ] قازی محەمەدی خدری. (٧) وەزیری جەنگی حوکومەتی کوردستان [محەمەد حسەین‌خانی سەیفی قازی].

ئەندامەکانی حوکومەتی میللی ئازەربایجانیش ئەمانە بوون:

(١) سەرۆکی میللی مەجلسی ئازەربایجان «حاجی‌میرزا عەلی شەبوستەری».

(٢) سەرۆکی وەزارەتی میللی ئازەربایجان «جەعفەر پیشەوەری».

(٣) معاونی دەستەی مەرکەزی «حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان» [سادق پادگان].

(٤) وەزیری ناوخۆی حوکومەتی ئازەربایجان [سەلام‌اللەی جاوید].

(٥) وەزیری فەرهەنگی حوکومەتی ئازەربایجان «بیریا».

بەندەکانیش کە لەسەریان رێکەوتن بەمجۆرە بوون:

[(١) لەو شوێنانە کە پێویستە، هەر دوو حوکومەتی ئازەری و کوردی ئەتوانن سەفیر و کونسوڵ لە ولاتی یەکا دابنێن.

(٢) لە ولاتی ئازەربایجان؛ واتە لەو شوێنانەدا کە زۆرتر دانیشتووەکانی کوردن، کاروفەرمانی حوکومەت لەدەست کوردەکانا بێت. هەروەها لە ولاتی حوکومەتی کوردستانیشا ئەو شوێنانەی کە زۆرتر دانیشتووەکانی ئازەرین، کاروفەرمانی حوکومەت بەدەست ئازەریەکانەوە بێت.

(٣) بۆ جێبەجێ کردنی کاروباری ئابووری هەر دوولا، کۆمەڵێک لە پیاوانی هەر دوو کیشوەر دائەنرێن، ئەوشتانەی کە ئەو کۆمەڵە دایئەنێن سەرۆکی هەر دوو حوکومەت بڕیاری لەسەر ئەدا ئەو وەختە ئەکەوێتە ئیشەوە.

(٤) لەکاتی پێویستی‌دا هەر دوو حوکومەتی ئازەربایجان و کوردستان قۆل ئەکەن بە قۆڵی یەکا و یەکیەتی جەنگی و سەربازی پێکدێنن و ئەوی پێویست بێ بۆ کۆمەککردنی یەک، بەجێی دێنن.

(٥) ئەگەر وەختێک پێویست بوو بەوەکە قسەوباس و خواسێک لەگەڵ حوکومەتی [تاران]دا بکرێ، ئەبێ هەردوو حوکومەتی کوردستان و ئازەربایجان پێکەوە بڕیار بدەن، ئەو وەختە بچنە ناو قسەکەوە.

(٦) ئەو کوردانەی کە کەوتوونەتە ولاتی ئازەربایجانەوە ئەبێ حوکومەتی میللی ئازەربایجان

کۆشش بکا بۆ پێشکەوتنی زمان و فەرهەنگی میللی ـ یان. هەروەها حوکومەتی کوردستانیش ئەو کۆششە بکا بۆ ئەو ئازەربایجانیانە کە کەوتوونەتە خاکیەوە.

(٧) ئەگەر هاتو یەکێک یا هەندێک کەوتنە سەرئەوە کە خەریک بن بۆ تێکدان و لەناوبردنی دۆستایەتی و یەک نەگرتن و لێک جیا کردنەوەی ئەم دوو میللەتە، ئەمانە بەهەر دووکیانەوە کۆشش بکەن بۆ لە ناوبردنی ئەو دەستەیە و بۆ تۆڵەدانەوەی ئەو کەسە کە ئەکەوتە سەر ئەم خەیاڵە!.].

کە ئەم پەیمانە بەمجۆرە بەسترا، لە ئێستگەی تەورێزا بلاوکرایەوە و پاشان بەندەکان بەشێوەی ئازەری و کوردی کران بە «بلاوکراوە» و لە ولاتەکانی ئازەربایجان و سابلاخا بلاوکرانەوە، بە تایبەتی لە پاش بەستنی ئەم پەیمانە حوکومەتی [قازی] بەتەواوی کەوتە ئیشکردن لەولاتەکانی کوردەواری دا. ئەو هێزانەی کە هەیبوو لە دەوروبەری «بانە» و «سەردەشت» دا ئەوەندەی‌تر بەهێزی کرد، لە ولاتی «سەقز» و «سەرا» دا ـ کەمەرکەزی قیادەی کوردی بوو ـ بنکەی تەواوی داکوتا. بەگزادەکانی [سوێسنایەتی] و [گەورک] لەدەوروبەری سەردەشت لەگەڵ بەرەی پشدەریەکانی عێراق ئاشنایەتی خۆیان لەگەڵ سابلاخا تازە کردەوە، لە دەوروبەری «سەقز»یش لەلایەکەوە «حەمە ڕەشیدخان» و لەلایەکەوە «فەیزوڵلا بەگی»یەکان ئەو ناوەیان قایم کرد. بەرزانییەکان لەناو ئەو هەموو خاکانەدا رایەڵێک بوون لەبەینی [سابلاخ] و ئەو شوێنانەدا بۆ ڕێ پێشاندان و بۆ قایمکردنەوەی سنورر و جەنگەکانی ئەو ناوچانە!.

* * *

کارەساتی حوکومەتی «قازی محەمەد» لەگەڵ حوکومەتی پیشەوەری ـ دا، دوو رنجیرە زنجیرن و لەگەڵێ لاوە پێکەوە بەستراون، لەبەرئەوە پێویستە لەهەندێ شوێنا چاوێک بەو هات و چووانەدا بگێڕین کە [تەورێز] لەگەڵ «تاران»دا ئەیانکرد.

ئەوەبوو لە ١٠ی نیسانی ١٩٤٦دا دەستەیەک بەسەرۆکی «جەعفەر پیشەوەری» بۆ قسەکردن لە کاروباری [ئازەربایجان] و لەگەڵ ئەویشا کوردستان، چوون بۆ [تاران]. ئەوشتانە کە ئەمان لە حوکومەتی تاران بۆ بنج بەست کردنی حوکومەتی ئازەری و کوردی داوایان ئەکرد ١٤ بەند بوون. پێویست بە باسکردنی بەندەکانی ناکا، چونکە هەر جۆرێک بوون حوکومەتی تاران بڕیاری لەسەر نەدان!. لە ئاخرا لە ١٣ی مایسی ١٩٤٦دا دەستەی نێراو بەبێ ئەوە بگەن بە شوێنێک گەڕانەوە بۆ «تەورێز». دیارە ئەم چوونەیان لە پاش ئەو پەیمانە بوو کە لەگەڵ حوکومەتی قازی محەمەد ـ دا بەستبوویان. هەر ئەو پەیمانە ـ ش بوو کە ئیشێکی وای کرد حوکومەتی تاران بکەوێتە تەلاشی ئەوە کە لەگەڵ هەر دوولایانا رێکەوێ، لەگەڵ ئەوەش هەر رێنەکەوتن!.

کە ئەمان گەڕانەوە بۆ [تەورێز]، ئیتر دەستیان دا بە ئەنجام گەیاندنی ئەو بەندانەوە کە لەگەڵ حوکومەتی «قازی» دا دایانابوون. حوکومەتی [تاران] کە سەیری کرد ئەمانە بەتەواوی دەستیان

داوەنێ لەوانەیە ئەگەر بەمجۆرە بڕوا ئیش وکار بەلای تارانا هەتا دێت بێ هێزتر ئەبێ!. پەشیمان بووەوە لەوە کە وەختێ خۆی لەگەڵ نێرراوەکانی تەورێزا رێ نەکەوتووە. ئەمجا بە ناچاری، ئەو دەستەیەکی لەژێر سەرۆکی «مـوزفەر فـەیروز» دا رێکخست و لە ١١ی حوزەیرانی ١٩٤٦دا ناردنی بۆ [تەورێز] بۆ ئەوە سەرلەنوێ بکەونەوە گوفتوگۆکردن لە چۆنێتی بەینی تاران ـ تەورێز ـ سابلاخ ـ ەوە.

ئەم دەستەی تارانە لە رۆژی دواییدا لەگەڵ سەرانی حوکومەتی «ئازەربایجان» و «سابلاخ»دا کومیتەیەکیان چنی و کەوتنە قسەکردن. لە ١٤ بەندەکەی پێشوو ـ کە وەختێ خۆی دەستەکەی [تەورێز] بۆی چووبوونە تاران ـ ٧ بەندی تیا هەبوو کە زۆرتر رازی نەبوونی تاران لەو ٧ بەندەدا بوو، ئەمجارە «موزفەر فەیروز» لەلایەن حوکومەتی تارانەوە لەو بەندانەی توزێ شل کـردەوە و لەعەینی وەختا تەورێز و سابلاخیش دیسان توزێ شلیان کردەوە و لە ئەنجاما بەیەک گەیشتن.

[موزفەر فەیروز] ئەم بەیەک گەیشتنەی بەسەر کەوتنێکی زۆر زل زانـی و هـەر لە رادیـوی تەورێزا بەندەکان و رێکەتنەکەی بلاوکردەوە، ئەمجا لەگەڵ پیشەوەری ـ دا ئیمزای بەندەکانیان کرد و بەسەرکەوتوویی گەڕایەوە بۆ «تاران».

ئەبێ ئەوەش بزانین کە هەندێ لەو کەسانە کە لەگەڵ «موزفەر فەیروز» دا بۆ ئەم قسەکردنە چووبوون بۆ [تەورێز]، لە ئەفسەرانی لەشکری [ئێران] بوون. هەندێک لە بەندەکان ئاشنایەتیان بە کاروباری ئەرتەشی ئێرانەوە هەبوو، ئەم ئەفسەرانە بۆ ئیمزاکردنی، خۆیان ئەگرت. لەبەر ئەمە ئەوان ئیمزای بەندەکانیان لەلایەن ئەرتەشەوە نەکرد و هەروا بەبێ ئەوە بگەن بەبناوانێ، گەڕانەوە بۆ «تاران»!.

ئەمجا بۆ جاری دووەم دەستەیەکی تر لەژێر سەرۆکی «شەبوستەری» سەرۆکی مـەجلسی میللی «ئازەربایجان»دا لە ٢٠ی ئاغستۆزی ١٩٤٦دا چوونەوە بۆ «تاران» بۆ قسەکردن لە کەین و بەینی ئەو بەندانە کە وەختێ خوی هەزارو یەک قسەی لە سەرکراوە!. نمایندەکانی ئازەری چەند بەندێک هەبوو ئەمانەیان زۆر مەبەست بوو، وەکو ئەوە:

(١ـ ئەو ئەفسەرانەکە لە لەشکری «ئێران» هەلاتوون و چـوونەتە لەشکـری ئـازەربایجانەوە، ئەمانە بگەڕێنەوە بۆ لەشکری «ئێران» بە زیاد لە پایەکەی خۆیان.

٢ـ ئەو ئەفسەرانە کە لە لەشکری دیموکرات دا هەن، [ئێران] هەموویان بە ئەفسەری تـەواو بناسێ.

٣ـ حوکومەتی «ئێران» لە ساڵا ملیون و نیوێک تمەن بخاتە ناو میزانیەوە بۆ ژیانی لەشکـری «ئازەربایجان».

٤ـ فەرماندەی لەشکر و ئامرفەوجەکـان بـۆ [ئازەربایجان] ئـەبێ بـە قـسەی «ئـەنجومەنی ئەیالەتی ئازەربایجان» بێت.

٥ـ سەربازی ئیجباری ئازەربایجانی هەر ئەبێ لە «ئازەربایجان» بمێننەوە.

٦ـ ئەگەر ئاژاوە و هەرایەک بوو بە ریشی ئێرانەوە، هێزی [ئازەربایجان] لە پاش ئەوە کە «ئەنجومەنی ئەیالەتی» بڕیاری لەسەردا، ئەتوانێ بچێ بۆ [ئێران] جەنگ بکا.

٧ـ ئەفسەرەکانی [ئازەربایجان] نەچن بۆ شوێنێکی تر، هەروەها ئەفسەری شوێنێکی تریش نەیەت بۆ [ئازەربایجان] مەگەر بە قسەی «ئەنجومەنی ئەیالەتی» نەبێ.).

کێشەکەیان زۆرتر لەسەر ئەم شتانە بوو، ماوەیەکی زۆر مانەوە، تا قەوام رازی ئەبوو، ئەرتەش رازی نەئەبوو، تا ئەمانە رازی ئەبوون «شا» رازی نەئەبوو!. بەکورتی هەر دەستی دەستییان پێ ئەکرا. ئەمانە ماوەیەکی زۆر لە «تاران» مانەوە، لەملاوە لە «تەوریز» و «سابلاغ» سەیریان کرد «لیژنە» نەگەیشتوتە ئەنجامێک و شوێنێکیشی دیار نییە کە بێتەوە، دەستکرا بە [موزاهرە]کردن بۆ هاتنەوەیان و لەسەر یەک، لەسەر یەک داوایان ئەکرد کە بگەڕێنەوە، لە ئاخرا لیژنە لە پاش مانەوەی نزیکەی دوو مانگ و نیو گەڕانەوە، بە بێ ئەو شتێک لەگەڵ خۆیان بێننەوە!.

هەروەها لەتەموزی ١٩٤٦ دا حوکومەتی ئێران بەجۆرێکی رەسمی «قازی محەمەد»یشی بانگ کرد بۆ [تاران]، دیسان ئەمیش هەر بۆ قسەکردن لە کاروباری کوردەوارییەوە، پێشوازیەکی باشیان کرد. لەپاش قسەکردنێکی زۆر و رێ نەکەوتن، [قەوامولسەڵتەنە] لەدەرگایەکی ترەوە سەری دەرهێنا، وتی:

«ئەگەر بێت و قازی و حوکومەتی کوردستان واز لە دۆستایەتی و هاریکاری ئازەربایجان بێنن، حوکومەتی ئێران هەر ناوچەیەکی کوردەواری لە ئێرانا هەیە، وازی لێ دێنێ بۆ ئەوە هەمووی بکەوێتە سەر حوکومەتی کوردستانی قازی محەمەدا.».

[قازی] ئاشنا نەبوو بەم قسەلووسانە و حوکومەتی ئێران وەڵامێکی لێ وەرنەگرتەوە. کە لەم دەرگاشەوە هیچ نەکرا، بە هۆی «عەبدوڵلای ئێلخانی زادە»وە کەوتنە ژێر پێی «قازی محەمەد» کە بچێت چاوی بە «شا» بکەوێ، شا رازی ئەکا و ئەشینێرێ بۆ «ئەمەریکا» بۆ سەیران کردن!.

دیارە لەم رووەشەوە هەر هیچ نەکرا و پاش ئەوە «قازی» گەڕایەوە بۆ «سابلاغ»!.

* * *

لەو رۆژانەدا کە جەنگی گەورەی دووەم کاروباری هەموو وڵاتێکی تێکدابوو، جیاییەک نەبوو لە بەینی ئەو شوێنانەدا کە تێکەڵاوی شەڕ ببوون لەگەڵ ئەو جێگایانەدا کە تێکەڵاو نەببوون!.

وڵاتی «ئێران» یەکێک بوو لەو شوێنانە کە گۆیا تێکەڵاو نەببوو، بەڵام لە مایسی ١٩٤١دا کە سوێندخوارەکان چوونە ناویەوە، کاروباری گەلێ لەو وڵاتانە خراپتربوو کە ئاڵا بوون بەجەنگەوە!. بڕیاری سوێندخوارەکانیش لەگەڵیا ئەوەبوو کە هەر لەگەڵ شەڕ دوایی هات؛ ئەوان لەشکری خۆیان ئیتر لەو وڵاتە بکێشنەوە!.

لە ٢٦ی نیسانی ١٩٤٥دا شەڕ دوایی هات، بە پێی ئەو پەیمانانە ئیتر ئەمان ئەبێ دەرچن،

دەرچوونیش زۆر ستەمە چوونکە ئەمان هەموو رۆژئاوای ئێرانیان کردووە بە وڵاتی خۆیان، واتە لەنیوەی شیمالیەوە تا نیوەی جنوبی. ئینگلیز لە «ئابادان»ەوە ئەسوورێتەوە تیایا تا ئەگاتە «سنە». روس ـیش لە «تەورێز»ەوە تا ئەگاتە «سەقز»!.

ئەمە و بێجگە لەمەش لەژێرەوە ئینگلیز ئەڵێ: روس دەرچێ تا منیش دەرچم. روس ـیش عەینی قسە ئەڵێ: ئینگلیز دەرچێ تامنیش دەرچم!. بەڵێ بە ئاشکرا ئەمە ناڵێن چونکە پەیمانەکە ئەمەی تیا نییە، واتە ئەمە بڕ و بیانووە، بەلام لەبەرئەوە کە ئەم دووە، لە دلا دڵیان لە عاستی یەک پاک نییە، ئەم بڕ و بیانووانە دێننە ناوەوە. دیسان ئەو شوێنانە کە ئەمان هات و چۆی تێدا ئەکەن هەمووی شوێنی نەوتە، نەوتیش بۆ ئەو رۆژە لە هەموو سەرمایەیەک بەنرخترە.

ئینگلیز هەر لە زۆر لە مێژە دەستی لە نەوتی «ئابادان» گیربووە و لەگەڵ ئێرانا هاوبەشە تیایا و ئەتوانێ بەناوی هەڵسووڕاندنی بەشە نەوتی خۆیەوە پێ دابگرێ!. بەلام روس هیچی بەدەستەوە نییە و ترسێکی گەورەش رووی تێکردووە؛ روس نەوتی هەیە و لە قەوقاز «باکۆ» دایە، باکۆ ـیش کەوتۆتە خاکی خۆیەوە، ئەوەندە هەیە بێجگە لەوە کە بیرەنەوتەکانی قەوقاز زۆرتریان بە هۆی شەڕەوە پەکیان کەوتووە، رەگ و دەماری ئەو نەوتەی کەوتۆتە وڵاتی [ئازەربایجان] و کوردەوارییەوە؛ ئەگەر رۆژێک لە رۆژان لە وڵاتی ئازەربایجان بیرێک لێبدرێ، مەعنای وایە نەوتەکەی «باکۆ»ی ئەو، هەمووی وشک ئەکا!.

هەر ئەم ترسەیە کە لە سەدەی نوزدەهەمەوە وا لە دڵی روسا و لەو وەختە بەدواوە هەموو دەمێک لە کۆششی ئەوەدابووە کە بەڵکو ئیشێکی وا بکا ئەو وڵاتی «ئازەربایجان» و کوردەوارییەی بکەوێتە ژێر دەست و لەو ترسە رزگاری بێ!.

لەدەورەی شایەکانی قاجارا هەر هەرا و هوریایەک کە لەبەینی ئێران و روسا بووە، هەر لەسەر ئەوە بووە، هەر ئەو ترسەش بوو کە شایەکانی قاجاری وا لێکردبوو هەموو وەخت «وەلیعەهد» لە تەورێز دانیشێ!. لە شەڕی گەورەی یەکەما ـ روسی قەیسەری ـ سەری تیاچوو و هیچ نەکرا. لەشەڕی گەورەی دووەما سەرەتا ئینگلیز و روس گیریان خواردبوو بە دەست جەنگی [هیتلەر]ەوە. کە ئەو جەنگەش دوایی هات، هەرچەندە لە ١٩٤١دا لەدەوری [رەزاشا]دا ئەگەر «ئینگلیز» لێی تێک نەدایە، زۆری نەمابوو ئیمتیازەکەی دەستکەوێ، کەچی سەرباری ئەمە ئاو و هەوا لە دەورەکانی پێشوو گەلێ خراپتربوو، بۆ ئەوە کە روس نەوتی «ئازەربایجان»ی دەست نەکەوێ، بەڵکو هەر لەدەستی دەرچێ!. چونکە لەملاوە ئینگلیز بە جۆرێکی ئاشکرا و راستە و راست دەستی لە ئێرانا هەبوو، ئەیتوانی پێی خۆی لەگەڵ ئێرانا نەبڕێ، ئەیتوانی رۆژی لە رۆژان بەناوی دۆستایەتیەوە لەگەڵ «ئێران» رێکەوێ و هەڵیخەڵەتێنێ بۆ ئەوە دەست بکا بە بەرهەم هێنانی نەوتی «ئازەربایجان»!. کە ئەم نەوتە پێک هات روس لە خاکەکەی خۆیشیا تنۆکێ نەوتی بۆ نامێنێتەوە و ناشتوانێ هیچ قسەبکا، چونکە ئێران ئەڵێ: «کەری خۆمە و گوێی ناڵ ئەکەم!.». واتە

نەوتی خۆمە و لە خاکی خۆمایە و چی لیٚ ئەکەم لیی ئەکەم!.

جا ئەم ترسە، «روس»ی وا لیٚکردبوو کە بە هەر جۆربووە ئیشێکی وا پێک بێنیٚ، بەڵکو بەلانی کەمەوە وڵاتی «ئازەربایجان» لەژێر چاوێری ئەوا بێت و توزیٚ لەو ترسە رزگاری بییٚ!.

هەڵگیرسانی ئەم شەڕی گەورەی دووەمە، لە بار بوو بۆ ئەوە کە حوکومەتە گەورەکان، واتە شەڕ هەڵگیرسێنەرەکان لەبەر بە رێوە چوونی کاروباری خۆیان شەیپوریٚ بگرن بەدەمەوە و بە دنیادا بلاٚوی بکەنەوە بلێن: قەومە کەمەکان، یا قەومە ئازادی لیٚ زەوت کراوەکان، ئەبیٚ ئازادی و سەربەخۆیی خۆیانیان بدرێتیٚ!.

ئەم قسەیە دارێکی چاک بوو بۆ ئەو رۆژە کە روس بیگریٚ بەدەستەوە و بلیٚ «ئازەربایجان» و کوردستانیش ئەبیٚ سەربەخۆیی خۆیانیان دەستکەویٚ. بێگومان ئەگەر ئەمان لە رێگەی ئەوەوە بگەن بەو سەربەخۆییە، هیچ شک لەوەدا نییە کە نەوتی ئەو وڵاتە ترس لیٚ نیٚشتووەکانی دەست ئەکەویٚ و ئیتر هیچ شتێک نامێنێتەوە کە ببیٚ بە کۆسپ لە رێگەیا!.

بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش ئەبیٚ کۆشش بکریٚ، کۆششەکەش ئەوەیە کە لەناو دانیشتووەکانی ئەو وڵاتانەدا بلاٚو بکرێتەوە کە بلێن «ئێمە سەربەخۆییمان ئەویٚ». بۆ ئەمەش ئەبیٚ پیاویان لەو وڵاتانەدا بگەڕیٚ و پیاوی ئەمانیش بچنە وڵاتی ئەوانەوە!.

لەو ناوەدا و لەو دەورەدا «کلینسکی» و «ئەسمبرنۆف» و «ئەسداف»، یا خۆیان یا پیاوەکانیان ئەگەڕان و خۆیان لەخەڵک هەڵئەسوو، لەملاشەوە هەرجارە پیاوی وەکو «قازیمحەمەد» و «پیشەوەری» و «شەبوستەری» بانگ ئەکران بۆ وڵاتی «روسیا» و «قەوقاز» هەر بۆ چاو پێکەوتن و دەم بەیەک گەیشتن!.

ئەم هۆیانە هەموو یەکیان گرتبوو، بۆ ئەوە لەو وڵاتانەدا دەنگێک بەرز ببێتەوە و ئەوی پێی بکریٚ، کەڵکێک لەو رۆژە وەربگریٚ. کزیی و بیٚتینی حوکومەتی ئێرانیش زیاتر زەویەکەی ئاو ئەدا. وەزارەتەکانی «سەدر» و «حەکیمولمولک» هیچیان بەکەڵکی ئەوە نەئەهاتن کە بتوانن بەتەواوی کاروباریٚ بگرنە دەست. ئەوەبوو کوت و پڕ لەم وەختە ناسکەدا [قەوامولسەڵتەنە] هاتە مەیدانەوە و وەزارەتی ئێرانی درووستکرد. دەرگایەکی سەربەستی خستە سەرگازی پشت، ئیجازەی دایەوە بە حیزبە داخراوەکان، سیٚ ئەندامی لە حیزبی «تودە» خستە ناو وەزارەتەکەیەوە، ئینگلیزخواکانی گرت و خستنیە بەندیخانەوە!.

کە ئەمانەی کرد، ئەمجا هات حیزبێکی بەناوی [حیزبی دیموکراتی ئێران]ەوە درووستکرد. دانانی ئەم حیزبەی بناغە بوو بۆ پشت شکاندنی [حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان] و [حیزبی دیموکراتی کوردستان!]. چونکە بەرەبەرە لە پیاوانی ئەو دوو حیزبەی را ئەکێشا و ئەیخستنە ناو حیزبەکەی خۆیەوە، زۆرتر کۆششی ئەوەی ئەکرد، کە سەرۆک عەشرەتەکانی ئەو وڵاتانە بخاتە ناو جغزەکەی خۆیەوە.

هەروەها لە ڕۆژی ١٧ی شوباتی ١٩٤٦دا وەزارەتەکەی خۆی خستە پێش چاوی پارلەمان و باوەڕی لێیان وەرگرت. ڕۆژی دوایی، واتە ڕۆژی ١٨ی شوبات باڵی گرتەوە «موسکۆ» بگرە و هاتم! لەوێ تا ٧ی مارتی ١٩٤٦ مایەوە، چاوی بە «ستالین، مۆلۆتۆف و سادچیکۆف» کەوت و پاش ئەو ماوەیە گەڕایەوە بۆ «تاران»!.

* * *

ئەم چوونەی «قەوامولسەڵتەنە» بۆ «موسکۆ» لە باری پیلان و سیاسەتەوە ناوچەیەکی زۆر زلی هەبوو؛ ئەوە بوو لەو وەختەدا روسەکان بۆ دەستخستنی نەوتی «ئازەربایجان» زۆر لە پەرۆشا بوون، ئەو هەموو لاپەڕە سیاسییانە کە لەو وڵاتەدا هەڵئەدرایەوە هەمووی هەر بۆ ئەو نەوتە بوو.

کە «قەوام» ڕۆیشت و چاوی بە کاربەدەستانی روس کەوت، پێی وتن «ئاو و هەوای ئێرانی ئیمڕۆ ئەوە هەڵناگرێ کە بەوجۆرە پارچە پارچە بێتەوە. ئەو نەوتەی کە کەوتۆتە شیمالی ئێرانەوە و ئەو سەری بەستراوە بە «باکۆ» و «قەوقاز»ەوە و ئەم سەری تا سەر ڕووباری چەغەتوو - میاندواو دێت؛ من بەو ناوەوە کە سەرۆکی حوکومەتی خاوەن نەوتم، ئەتوانم ئیمتیازی ئەو نەوتە بدەم بەروس، ئیتر ئاو بکرێ بەئاگرا!».

ئەم قسانەی «قەوام» فێنکییەکی دا بە دڵی کاربەدەستانی روس و لەسەر ئەم بناغەیە چوونە سەر مێزی قسەکردن و پەیمان دانان بۆ ئەم باسە.

ئەو پەیمانانە کە لەم ڕووەوە لەلایەن قیوامەوە بۆ ئەم باسە دانرا ئەمانە بوون:

(١ـ ئەم لە پێشا بەو ناوەوە کە سەرۆکی حوکومەتە، ئیمزای ـ دانی ئەم ئیمتیازی نەوتە بەروس ـ بکات.

٢ـ لەم تەئریخەوە تا ماوەی ٧ مانگ ئەو پارلەمانەی کە ئێستە لە ئێرانا هەیە، بیخات و پارلەمانێکیتر درووست بکاتەوە، بۆ ئەوە ئەو پارلەمانی تازەیە بڕیار لەسەر دانی ئەم ئیمتیازە بدات، بۆیەش ئەم پارلەمانە بخات، چونکە ئەمەی ئێستە بە جۆرێکی سەربەستانە نەهاتوونەتە ناوەوە! ئەبێ بۆ ئەم مەسەلەیە «پارلەمان»یکی وا بێت کە هەموو ئەندامەکانی بە ئەو پەڕی سەربەستی میللەتەوە هەڵبژێرێن.

٣ـ لە ئێستە بەدواوە روس لەشکری خۆی لە ناوچەی نفوزی ئێران ـ بە تایبەتی ئازەربایجان و کوردستان ـ بکشێنێتەوە بۆ ئەوە لە کاتی هەڵبژاردنی نائیبەکانی پارلەمانی تازەی ئێرانا هیچ دەنگێکی بێگانە لەو ناوانەدا نەمێنێ، ئەمەش بۆ ئەوە نەوەک خەڵکی دەست بکەن بە قسەکردن بڵێن هەڵبژاردن سەربەست نەبووە و لەمەوە قسەیتری لێ بێتەوە!).

ئەو مەرجانەش کە کاربەدەستانی «روس» لەم ڕووەوە دایاننا، ئەمانە بوون:

(١ـ بەهەموو مەعنایەک ئەبێ هەڵبژاردن سەربەست بێ لەهەموو ناوچەکانی «ئێران» دا و نابێ دەمێ بێگانە لە هیچ لایەک لەم ڕووەوە ورتەی لێوە بێت.

۲ـ مەسەلەی «ئازەربایجان» و دەوروبەری ئەبێ بە هێمنی و سیلم ببڕێتەوە).

هەر دوولا لەسەر ئەم مەرجانە رازی بوون و ئیمزایان کرد و [قەوام] بە خۆی و بە پەیماننامەیەوە گەڕایەوە بۆ «تاران» و کەوتە کۆڕی ئیش کردنەوە، لە هەموو زیاتر ئەوەی بلاوکردەوە کە ئەبێ سەرلەنوێ هەلبژاردنێکی سەربەست لە ولاتا دەست پێبکرێ بۆ ئەوە ئازەربایجان و کوردستان [نائیب]ی خۆیان بە جۆرێکی ئازادانە بنێرن بۆ [پارلەمان] و ئەو وەختە ئەوان چ بڕیارێکیان دا لە بارەی پاشە رۆژی ولاتەکەیانەوە، حوکومەتی «ئێران» لەبەر رووناکی ئەو باوەڕەی ئەوانا ئەچێ بە رێوە!.

* * *

لەبەین بەینی ئەم تەئریخانە دا ئەوە بوو کارەساتەکانی کوردەواری لەهەموو ئەو ولاتانەدا لە جوولە جوولا بوون، هێزەکانی کورد هەر رۆژە لەلایەکەوە پێش ئەکەوتن. حوکومەتی ئێران زۆرتر وەختی بەوەوە را ئەبوارد کە ئاژاوە و شەڕی بەرپشەوە نەبێت، وا دیاربوو هەوای ئەو رۆژەی بەباش نەئەزانی بۆ خۆی!.

لەو سەردەمانەدا قسە و باسێک لەبەینی [تاران] و [تەورێز]دا هەبوو کە «زەنگان» لەسەر ئازەربایجان نەمێنێ و بەلکو بکەوێتە سەر ولاتێکی‌تر لە ولاتەکانی ئێران. بەرانبەر بەمە حوکومەتی «ئێران» بەهەموو مەعنایەک «تیکاب» و «سەردەشت» چۆل بکا و «دیموکراتی ئازەربایجان» بچنە ناویەوە. دیارە ئەو دیموکراتانەش کە لەو ناوەدا بن هەر دیموکراتی کوردستانە و ئەوان ئەچن داگیری ئەکەن. ئەمە وای لێهاتەوە کە «تیکاب» و «سەردەشت» بەبێ هیچ قسەیەک بوو بە هی حوکومەتی «کۆمەلە».

تەنانەت لەسەر ئەم راوتەگبیرەش، «سەدری قازی» لەلایەن حوکومەتی کوردستان و [قازی محەمەد]ەوە نێررا بۆ [سەقز] کە لەگەل [هومایونی] فەرماندەی نەیروی ئێرانا قسە بکا و ئەم باسە ببڕێننەوە. کە چوو فەرماندە بەم باسە رازی نەبوو، «سەدر» قاقەزێکی رەزامەندیی [قەواموسەلتەنە]ی ـ کە لەم رووەوە دابووی بە «دوکتور جاوید» لە تەورێز و وێنەی ئەم قاقەزە کەوتبووە لای «سەدر» ـ دەری هێنا و پیشانی دا.

کاغەزەکەش ئەوەبوو کە قەوام نووسیبووی بۆ دوکتور جاوید فەرماندەی «ئازەربایجان»:

(ئێمە رازین بە ۱۵ رۆژ دوای چۆل‌کردنی زەنگان، تیکاب و سەردەشت لە نەیروی ئەرتەشی پاک بکرێتەوە و هێزی نیزامییان بین بە هێزی دیموکراتی ئازەربایجان. [ئەحمەد قەواموسەلتەنە] ٤ی تشرینی دووەمی ١٩٤٦).

هومایونی و «عەلەوی» کە بەناوی فەرماندەی لەشکری سێ وە لەوێندا بوون، داتێکیان بەم فەرمان و رێکەوتنەدا نەنا و وتیان لەلایەن ئەرتەشەوە ئێمە لەم رووەوە هیچمان وەرنەگرتووە. بەبێ ئەوە بگەن بە ئەنجامێک «سەدر» گەڕایەوە بۆ «سابلاخ»!.

* * *

«قەوام» لەگەڵ روسەکان ئەوەبوو رێ کەوتبوو؛ بڕیاری هەڵبژاردنی سەرلەنوێ درا، لەم ماوەیەدا ئەو تەکتیکانە کە ئەکرا، هەموو بۆ ئەوە بوون کە تا لە لایەکەوە حوکومەتی ئێران توزێ ئیشی خۆی قایم ئەکاتەوە، لەلایەکی تریشەوە بەڵکو لەم ماوەیەدا روس لەشکری خۆی لە ئازەربایجان بکشێنێتەوە.

وەخت زۆری نەمابوو بۆ دوایی هاتنی ئەو ماوەیە کە قەوام و [سادچیکۆف] دایاننابوو بۆ دوایی هاتنی هەڵبژاردنەکە. روس بە پەلە بوو بۆ ئیمتیازی نەوتەکە، ئێرانیش بە پەلەبوو بۆ دەرچوونی روس لەخاکەکەیا!. لە ئەنجاما روسەکان هەر ئەیانکردە سەر قەوام بۆ براندنەوەی ئیش. قەوام ـ یش ئاخر وەڵامی ئەوە بوو کە بە پێی پەیمانەکەمان ئەبێ ئێوە لە ولات دەرچن؛ ئەو وەختە ئیمە بکەوینە سەر هەڵبژاردن.

لێرەدا روس چاری نەما و هیچ بیانوویەکیش نییە بیگرێ بەدەستەوە بۆ دەرنەچوون، لەبەرئەمە وردە وردە لە ئەیلوولی ١٩٤٦دا دەستی کرد بە گەڕانەوە بۆ ولاتی خۆی و ئازەربایجانی چۆڵ کرد، لەسەر ئەو نیازە کە قەوام پارلەمانێکی تازە لە ئێرانا درووست بکا و «پارلەمان» ئیمتیازی نەوت بدا بە روس!.

کە روسەکان دەرچوون، قەوام مەیدانی بۆ چۆڵ بوو بۆ ئەو هەڵبژاردنە، کە خۆی ئەیەوێ. وردە وردە لە شوێنەکانی تری ئێرانا دەستی پێکرد و پاشان هاتەسەر ـ ئازەربایجان و کوردستانی ئازەربایجان ـ بە پێی هەندێ لە بەندەکانی پێشوو ـ کە لەسەری رێکەوتبوون ـ ولاتەکانی ئازەربایجان و کوردستان خۆیان بە هەموو سەربەستیەکەوە ئەتوانن نائیب بۆ خۆیان دابنێن.

لەم کاتەدا کوت و پڕ «پیشەوەری» بروسکەیەکی لە «قەوام»ەوە وەرگرت: «کە هێزێکی عەسکەری ئەبێ بێت بۆ ئازەربایجان بۆ ئەوە چاوێری هەڵبژاردن بکا، ئەمەش بۆ ئەوە نەوەک گەمە و گاڵتەی تیا بکرێ!».

ئەم خەبەرە کارێکی پێچەوانە و سەیری کردە سەر دڵی «پیشەوەری»!.

بەناچاری پیشەوەری ـ یش وەڵامی بۆ ناردەوە کە:

«بە پێی هەندێ لەبەندەکانی پەیمانی پێشوو ـ کە لەسەری رێکەوتبووین ـ لەشکری «ئازەربایجان» لەشکری ئێرانە. کە ئەم پەیمانە هەیە و لەشکری ئازەربایجانیش ئێستە هەیە، کەواتە پێویست بە هاتنی لەشکری «ئێران» ناکا. لەشکری [ئازەربایجان] خۆی ئەتوانێ بە بێ لایەنگری چاوێری هەڵبژاردنی خۆی بکا.»

[قەوام] لەو وەختەدا کە ئەو بروسکەیەی دابوو بە «پیشەوەری»، عەینی ئەوەشی لەلایەن کوردستانەوە دابوو بە قازی محەمەد. قازی ـ ش وەکو وەڵامەکەی پیشەوەری وەڵامێکی وای دایەوە بە [قەوام] کە ولاتی کوردەواری خۆی لەشکری خۆی هەیە و پێویست بە هاتنی لەشکری

حوکومەتی «ئێران» ئاکا بۆ ئەم هەڵبژاردنە.

دیارە کە [قەوام] ئەو بروسکانەی‌دا بە پیشەوەری و قازی، مەعنای وایە پەیمانی تاران - تەوریز حوکمی نەماوە و بە هیچ دا ئەنری!. لەبەرئەمە دوو دەستەی ئازەری و کوردی لە ١٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٦دا لە «تەوریز» کۆ بوونەوە و ئەم بڕیارانەی خوارەوەیان دا:

(١ـ درووستکردنی لەشکرێکی ئازەری ـ کوردی کە شوێنی لە «تەوریز» بێت.

٢ـ ناردنی لەشکری نیزامی ئازەربایجان بۆ قۆڵی [سەقز] لە کوردستان و ناردنی لەشکری غەیری نیزامی کوردستان بۆ «ئازەربایجان» ئەگەر پێویست بوو.

٣ـ دانانی «ژەنەراڵ عەزیمی» ئازەربایجانی بەسەرۆکی گشتیی لە قۆڵەکانی «سەقز» و «سەردەشت» لە کوردستان و، لە «هولاسۆ هەوشار» لە ئازەربایجان.

٤ـ دانانی «مەلا مستەفای بەرزانی» بە سەرۆکی گشتیی کوردی و ئازەری لە ناوچەی «سەقز».

٥ـ ناوچەی «هەوشار» لە ئازەربایجان لەژێر چاوێری «محەمەد حسەین سەیفی قازی» دا بێت.

٦ـ «قازی محەمەد» سەرۆکی گشتیی هەرە بەرزبێت لەسەر هێزەکانی ئازەربایجان - کوردستان، بەڵام لە ژێر رەنگ رشتنی ژەنەراڵ عەزیمی دا.

٧ـ «پیشەوەری» سەرۆکی هەرە بەرز بێت بۆ هێزە شەڕکەرەکانی کوردی - ئازەری لە «ئازەربایجان».

٨ـ هێزی کوردی هەر یارمەتییەکی تری ویست، «ئازەربایجان» دەستی بۆ درێژ بکات.)

بەمجۆرە ئەم پەیمانەش بەسترا و ئەمجا ئیتر قۆڵیان کرد بە قۆڵی یەکا بۆ بەگژا چوونی حوکومەتی ئێران بەهەر جۆرەی کە پێیان بکرێ. لە راستیشدا بەندەکان جێبەجێ کران و کەوتنە کۆڕی شەڕەوە. لەولاوە هێزی ئازەربایجان لە قۆڵی «زەنگان» و «میانە» ـ کە ئەم دوو شوێنە نرخێکی زۆری هەبوو بەرانبەر بە وڵاتی ئازەربایجان - لەملاشەوە هێزی کوردی لە قۆڵی - سەقز و بۆکان و بانە سەردەشت ـ کەوتنە ئیشکردنەوە.

لە بەرئەوە کە گرتنی «زەنگان» بۆ ئێرانییەکان بەرانبەر بە ئازەربایجان، کارێگەرییەکی زۆری هەبوو، هێزی ئێرانی هەموو کۆششێکی خۆی لەو قۆڵەوە خستبووە سەرگرتنی ئەوێ.

لە ٨ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦دا حوکومەتی ئێران بە پشتیوانی فڕۆکەکانی ئەمەریکی لەهەر دوو قۆڵەوە دەستی کرد بە شاڵاو هێنان. لە رۆژی ٩ داکوت و پڕ هێزی ئێران لە «سەقز» کشایەوە!.

کشانەوەی ئەم هێزە دوو مەبەستی تێدا هەبوو؛ یەکەم ئەوە بوو کە ئەیویست هەر بە هێزی هەوایی و فڕۆکەی ئێران و ئەمەریکی بکەوێتە ناوەوە، چونکە ئەیزانی بە هێزی سەرزەوی باشاری کوردەکان ناکا و پاشەڵی پیس ئەبێتەوە!. دووەم ئەیەویست ئەو هێزی قۆڵی «سەقز» زۆر بە خێرایی بگەیەنێتە خەتی «تیکانتەپە»، بۆ ئەوە، هێزی ئەولا بە هێزتر بکا و بکەوێتە بەینی هێزی

کوردی و ئازەری، ئەمەش بۆ ئەوە کە بەیەک نەگەن. دیسان هەر لەو قۆڵی [هولاسۆ]ەوە [جەبهەی ئێرانی] هەستی بەسستیەک کردبوو لە خۆیا، ئەگەر ئەم فیکرەی نەکردایە حاڵی شڕ ئەبوو لەوێدا.

هەرچەندە حوکومەتی «ئێران» لە ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٩٤٦دا «زەنگان»ی لەدەست ئازەربایجان هەڵپڕووکاندبوو، بەڵام ترسی هەرەزۆری ئەو لەقۆڵی «تیکاتەپە» و «هەوشار»ەوە بوو، کە ئەگەر لەوێدا هێزی کوردی و ئازەری بگەنەوە بەیەک، تازە ئەو ناتوانێ باشاریان بکا. لەبەرئەم ترسە ئەو پیلانە عەسکەرییەی رێکخست!.

* * *

وا دیاربوو قسەکردنەکانی «قەوام» و «سادچیکوف» لە موسکۆ جێگەی خۆی بەتەواوی گرتبوو، بۆیە روسەکان لەشکری خۆیان لە «ئازەربایجان» کشاندبووەوە، بێجگە لەوە کە لەشکریشیان کشاندبووەوە، تەمێی [پیشەوەری]شیان کردبوو، کە بەجۆرێکی هێمنی لەگەڵ ئێرانا بجزووێتەوە!. وادیاربوو سەرەتا [پیشەوەری] گوێی بەو ئامۆژگاریە نەدابوو، بۆیە هاتبوو لەگەڵ حوکومەتی «قازی»دا ئەو پەیمانی ١٦ی تشرینی یەکەمەی بەستبوو؛ کە روسەکان زانیان [پیشەوەری] بەدەسیاوی قازی وا هەر چۆتە کۆڕی شەڕەوە و بەربەرەکانی حوکومەتی ئێران ئەکا، بۆ جاری دووەم سەرلەنوێ بەجۆرێکی توند و تیژتر وەڵامیان بۆ ناردەوە کە نابێ بەربەرەکانی ئێران بکا و ئەبێ دەست لە شەڕ هەڵگرێ.

هەر لەبەرئەمە بوو کە بەجۆرێکی کوت و پڕیی، لە شەوی ١١ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦دا لەناکاو ـ بەلاغێکی لیژنەی مەرکەزی حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان ـ دەرچوو کە ئەبێ شەڕکردن لەگەڵ حوکومەتی «ئێران»دا بووەستێنرێ و ئیتر جەنگیان لەگەڵ نەکرێ!.

کە ئەم بەلاغە بیسترا، هێزی کوردی دەمی خۆی گەیاند بە قیادەی گشتیی بۆ ئەوە بزانێ چ باسە؟!. ـ قیادەی موشتەرەکە ـ وەڵامی دایەوە: «کە ئەم شەڕی ئێمە و حوکومەتی ئێرانە ئەبێتە هۆی شەڕێکی تری گشتی عالەمی، لەبەرئەوە پێویستە کە ئیتر جەنگ نەکرێ!.».

دیارە وەرگرتنی ئەم خەبەرە دەماری حوکومەتی قازی و کوردەکانی خاو کردەوە و لەگەڵ ئەوەشا کەوتنە دەریای سەر سوڕمانەوە!. ئەکوا پەیمانەکەی ئەمان و ئازەربایجان؟. لەکوێ ئەم خەبەرە!.

لەبەرئەمە «قازی محەمەد» لە شەوی ١٢ی کانونی یەکەمدا لە ماڵی خۆیان لە «سابلاخ» کۆبوونەوەیەکی زۆر گەورەی کرد و هەموو وزەرای حوکومەتی و سەرۆکی عەشایرەکانی کۆ کردەوە و کەوتنە قسەکردن لەم باسەوە. لە ئاخرا باوەڕیان هاتە سەر ئەوە: «لەبەرئەوە کە پەیمان لە بەینی ئەمان و ئازەربایجان دا هەیە و، ئێستەش [ئازەربایجان] ئەم بەلاغەی بڵاو کردۆتەوە، ئەمان ناچارن بە گوێی بکەن و وەکو ئەوان ئیتر شەڕ بووەستێنن، بۆ چی؟. بۆ ئەوە ئەم

شەڕکردنەی ئەمان نەبێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕێکی تری سێیەم لەعالەما!».

لەپاش ئەم کۆبوونەوە و بڕیارە، فەرمان دەرکرا کە هەر هێزێکی کوردی لەدەوروبەری «سەقز» و «سەردەشت» و ئەو ناوەدا هەیە، هەموو بکشێنەوە و ڕێگە بۆ هێزی حوکومەتی ئێران چۆڵ بکەن بۆ ئەوە بچنە ئەو شوێنانەوە.

ئەم کردەوەیە بە تەبیعەت ئەوەی پیشان دا کە هێزی کوردی تەرکی هەموو شتێکی کردووە و مەیدانی بە هەموو مەعنایەک بۆ حوکومەتی ئێران بەرەڵا کرد، کە چی نەکا بیکا!. قازی و دەوروبەرەکەی قازی وەکو ئەم فیکرە چووبووە دڵیانەوە؛ ئەوەش چووبووە مێشکیانەوە کە گۆڕانی ئەم پیلانە لەباری پێشووەوە بۆ ئەم بارە، بە دەسیاوی ڕوسەکان بووە، بێگومان کە ئەمان لەم پلەیەدا ئەگەر هاتو بەگوێی ئەوانیان کرد، ئەوانیش چاویان لەمان هەر ئەبێ.

هەر لەو شەوەدا ـ کە بەلاغەکەی لیژنەی مەرکەزی ـ دەرچوو بۆ وەستانی شەڕ، لە بەیانیا، واتە لە ڕۆژی ١١ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦ەوە هێزی حوکومەتی ئێران چووە ناوشاری «تەروێز»ەوە و تەورێزی گرت، لەملاشەوە ئەوە بوو هێزی کوردی لەهەموو وڵاتەکانی کشانەوە و حوکومەتی ئێران بەرەبەرە ئەو ناوچەیەی داگیر کردەوە!.

* * *

«بۆکان» هەرچەندە خۆی شارێکی بچووکە و ئەو سەردەمە ٦ هەزار کەسێک دانیشتووی هەبوو؛ کەوتۆتە بەین [سەقز] و [سابلاخ]ەوە. ٣٠ کیلۆمەتر لە [سەقز] و ١٠٦ کیلۆمەتر لە [سابلاخ]ەوە دوورە. بەڵام لە چاو ئەو ناوچە جەنگیانەی کوردەواری ئەو ڕۆژەوە ئەهەمیەتێکی زلی هەبوو. هێزی حوکومەتی ئێران لە ١٢ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦دا چووە ناویەوە وگرتیەوە. بە چوونە ناوی؛ [ئیعلانی عورفی] تیا دامەزراند. ئەمجا لەشکری ئێران لەوێوە ڕوو بە ڕووی «سابلاخ» بووەوە.

سەرەتا فیکرە وابوو کە «عەبدوڵلای ئێلخانیزادە» و «مام عەزیزی قەرەنیاغای مامش» ـ کە ئەمانە هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ حوکومەتی ئێران بوون ـ حوکومەت بیانهێنێ جڵو بەرگی سەربازی بکا بە بەر پیاوەکانیانا و سەرەتا ئەوانە بچنە ناوشاری سابلاخەوە!. ئەمەش بۆ ئەوە کە لە چوونی ئەمانە بۆ ناوشار ئەگەر هاتو ئەهلی شارەکە دەستیان کردەوە ـ چونکە ئەمانە ناپیاوەتی ئەکەن لە ناوشارا ـ یەکەم بۆ ئەوە با کوژراو هەر لە بەینی کوردەکان خۆیانا بێت!. واتە دەستەی [ئێلخانی زادە]یە هەر کوردە و، دەستەی [سابلاخ]یشە هەر کوردە... دووەم بۆ ئەوە پاشان حوکومەتی ئێران فوو بکا بە شەیپوردا بڵێ لەپاش ئەوەکە شەڕ وەستێنرابوو، حوکومەت ئەچووە «سابلاخ»ەوە، کوردەکان هاتن سەربازە ئێرانییەکانیان کوشت!.

لەبەرئەمانە «قازی محەمەد» لەگەڵ «ژەنەراڵ هومایونی» سەرۆکی عەسکەری ئەو ناوە قسەیکرد و هومایونی پەشیمان کردەوە لەو باوەڕە کە لە پێشا کوردەکان بەجلی سەربازیەوە

بنێرێته ناوشار.

ئەمجا لە ڕۆژی ١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦دا ئەبروی قۆڵی «بۆکان» لەولاوە و، هی «میاندواو» لەملاوە پێکەوە گەیشتن و چوونە ناوشاری سابلاخەوە و «سابلاخ»گیرا. بە پێچەوانەی هەموو دوژمنایەتییەک [قازی محەمەد] و خەڵکی شار پێشوازیان لە لەشکری تازە سەرکەوتوو کرد.

لەشکری سەرکەوتوو ـ لەشکری ئێران ـ کە چوونە سابلاخەوە، وەنەبێ بە پیاوەتییەکی پیاوانە چووبێتنە ناوشارەوە، بە چوونەکەیان دەستیان دا بە توند و تیژیی و خەڵک گرتنەوە، ـ مەحکەمەی عورفی ـ یان دانا، قازی محەمەد ـ یان گرت، کەوتنە ناوەوە لەوانەی کە سەر بە قازی بوون هەموویان گرتن. لەو سەردەمانەدا [سەدری قازی] ـ کە وەختێ خۆی نائیب بوو لە پارلەمانی ئێران لە «تاران» بوو، بۆ ئەوە لەم ڕووەوە لەگەڵ حوکومەتی «تاران»دا ئەوەی پێی بکرێ قسە بکا. لەوێش ئەوگیرا و هێنرایەوە بۆ «سابلاخ».

«قازی» و سەر بە قازی هەموو گیران و خزانە بەندیخانەوە، بەڵام لەبەرئەوە لەو ڕۆژانەدا [مەلامستەفای بەرزانی] لە ڕێی هات و چۆی تارانا بوو، ئیشی ئەو هێشتا لەگەڵ حوکومەتی تارانا دوایی نەهاتبوو، ئەوەندە بە توندی لەگەڵ ئەمانە ئەبزووتنەوە، کە ئیشی مەلا، لەگەڵ ئێرانا یەک لایی بووە، ئەمجا لەگەڵ دەستەی قازی ـ دا بە تەواوی تێهەڵچوونا.

بەڵێ ئیشی مەلا، یەک لایی بووەوە، بەڵام لەملاوە عەشایرە کوردەکانی‌تری سنوورەکانی ئێران ـ عێراق و تورکیا هەر لە مەیدانا بوون، لەبەرئەوانە گۆیا واپەدرایە بەر چاو کە لەگەڵ قازی و دەستەی قازی دا زۆر بە هێمنی و لەسەر خۆیی لەگەڵیان ئەبزوونەوە، بەتایبەتی مەحکەمە ئەوەندە میهرەبانە لەگەڵیان، مەگەر هەر باوک ئەوەندە میهرەبان بێ!. هیچ پرسیار و شتیان لێ ناکەن، لە بەندیخانەکە دا هەر وەکو لە ماڵی خۆیانا بن وانە!. وەکو گوڵ بەخێو ئەکرێن!.

لەم ماوەیەدا حوکومەتی «ئێران» بە پڕوپاگاندە کەوتە ناو سەرۆک عەشایەرەکانی ئەو ناوە بۆ ئەوە لە عاستی «قازی» هەڵیانبگێڕێتەوە!. بێجگە لەمەش بانگی کردن بۆ [تاران] و لە ڕۆژی ٣٠ی کانونی دووەمی ١٩٤٧دا گۆیا لە بانگهێشتنەکە دا «شاهەنشا»شیان زیارەت کرد و شاهەنشا خەڵاتی یەکە یەکەی کردن و هەموو بوون بە «شادۆست»، ئیتر کوردی چی و قازی چی و سابلاخی چی!!.

کە حوکومەت بەمجۆرە ڕەوشتانە وردە وردە هەندێ لە کوردەکانی لە [قازی محەمەد] هەڵگێڕایەوە، ئەمجا هێنای خستیە ژێر موحاکەمەوە، موحاکەمە ـ ش بە ناو موحاکەمە بوو، بەڵکو بۆ چاو بەستن بوو، ئەگینە ئەبوایە «قازی» هەر بکوژرایە.

لە ئاخرا لە موحاکەمەیەکی گۆیا دوور و درێژا، هیچیان لەسەر قازی نەدۆزیەوە تەنها دووشت نەبێ؛ یەکەم: ئاڵای حوکومەتی ئێرانی گۆڕیوە، سوورەکەی خستۆتە سەرەوە و سەوزەکەی

هێناوەتە خوارەوە و لە باتی «شێر و ڕۆژ»، گوڵە گەنمی لێ داوە و کردوویە بەهی «جمهوریەتی کوردستان»!.

دووەم: لەو تەمسیلانەدا کە لە دەوری حوکومەتی ئەوا ئەکران، هەموو جار تابلۆیەکیان ئەهێنا ئەمەیان لەسەر ئەنووسی: «بمرێ ئەو کەسەی کە نایەڵێ ئازادی کورد سەربگرێ!». حوکومەتی ئێران ئەمەی بەتانوت ئەزانی بۆ خۆی، وای ئەوت کە ئەمە گۆیا لەگەڵ ئەویانە!.

گوناحی «سەدری قازی»ش ئەوەبوو کە ئیشی لەگەڵ «قازی محەمەد» دا کردووە، هەرچەند وتی وەختی خۆی من [نائیب] بووم لە [تاران] و لە هەموو وەختێکما هەر خەریکی ئەوە بووم کە ئیش و کاری بەینی حوکومەتی ئێران و حوکومەتی «قازی» بکەوێتە بارێکی هێمنی، ئەم قسانە بە گوێی مەحکەمە ئاشنا نەبوون!.

گوناحی «سەیفی قازی»ش ئەوە بوو کە جلی ژەنەراڵی لەبەر کردووە!. ئەمیش هەرچەند وتی [قەوامسولسەڵتەنە] منی بەناوی فەرمانداری سابلاخەوە داناوە، ئەویش کەڵکێکی لەمە وەرنەگرت.

لە ٢٠ی کانونی دووەمی ١٩٤٧دا حوکمی خنکاندنی هەرسێکیان لە مەحکەمە دەرچوو!.

لەو ڕۆژانەدا هێشتا کاروباری بەرزانییەکان بە تەواوی نەبڕابووەوە، عەشایەرەکانی تر هێشتا بەتەواوی نەخرابوونە دواوە، حوکومەتی ئێران لەبەرئەمانە نەیئەویست بەتەواوی دەستی بداتێ، بەڵکو بۆی نەئەکرا چی خۆی ئەیەوێ ئەوەبکا!. ئەوەی کرد بە بیانووگۆیا نەوەک ئەو مەحکەمەیە جەوریان نواند بێت، پێویستە هەندێکی تر لە تارانەوە بێن بۆ ئەوە چاو بخشێننەوە بە مەحکەمەکەدا. ئەمەش لە ڕاستیدا وا نەبوو، بەڵکو ئەوەبوو کە تۆزێ وەخت درێژ تر کەنەوە، بەڵکو لەم ماوەیەدا ئیشیان بۆ یەک لایی بێتەوە، ئەگینا ئەوان ئیش هەر جۆر بیوایە، واتە بەهەق یا بە ناهەق ئەبوا ئەوانەیان هەر بخنکاندایە!.

ئەمجا لەسەر ئەو نیازە «سەرهەنگ نەجاتوڵلای زەرغامی» لە تارانەوە هات و چاوی گێڕا بە کاروباری مەحکەمەکەدا، سەیری کرد تەواوە و هیچ کەم و کوڕییەکی تێدا نییە، ماوەی ئەوە هاتووە کە بخنکێنرێن!. ئەویش فەرمانی بە خنکاندنیان دەرکرد و لە ٣١ی مارتی ١٩٤٧دا «قازی محەمەد» و «سەدری قازی» و «سەیفی قازی» لە ڕێگەی ئازادی کورددا لە ناوشاری [سابلاخ] خنکێنران!.

بەڵێ سەعات سێی پاش نیوەشەوی، ٣١ مارتی ١٩٤٧ سەعاتێکی ترسێنەر بوو لە ناوشاری سابلاخا. هەر لەو سەعاتەدا بوو [قەنارە]کانیان هەڵواسیبوو، سەربانی هەموو کۆشک و شوێنە بەرزەکان پڕکرابوون لە مەترەلۆز و چەکی ئاگرین، دەبابە و تۆپ ئەو ناوەی هەموو داگیر کردبوو. ئەمانە هەموو بۆ ئەوە کە [قازی محەمەد] داوای حەقی خۆی کردبوو، سەرباری ئەوە کە حەقەکەشیان نەدایە، ئەوا خەریکن ئێستە ملی ئەکەن بە پەتەوە!. پەتی جەور، پەتی زوڵم، پەتی

ناعەدالەتی و خوانەناسی.

«قازی محەمەد» چ لەوەختی خنکاندنەکەیا و چ لەوەختی موحاکەمەکردنەکەیا هەموو جار ئەوەی ئەوت: «کە خوێنی من بۆ ئێوە بێت، بەڵام «سەدر»ی برام بێگوناحە و لێی خۆش بن، من بۆ خوێنی خۆم ناپاڕێمەوە بەڵام بۆ سەدری برام ئەپاڕێمەوە، ئەو بێگوناحە لێی خۆش بن.» دادگای مەحکەمە و حوکومەتی ئێران لەم قسانە وەکو گوێزیان بۆ بژمێرن وابوو!.

[قازی محەمەد] لە پێش ئەوەدا ببرێتە بەر سێدارەکە، دەستنوێژێکی شۆرد، کە بردیانە بەر [قەنارە]کە، بەهەموو دڵ فروانییەکەوە دوو رکات نوێژی کرد و گەلێک لە خوا پاڕایەوە، مەعنەویاتێکی بە هێزی هەبوو، چووە بەر سێدارەکە و وتی:

[ئێوە ئێستە قازی محەمەد ـ یک ئەکوژن و ئیعدامی ئەکەن، بەڵام شەعبی کوردی هەر یەکە قازی محەمەد ـ یکن، بڕوام وایە ئەو قازی محەمەد ـ انە زۆر دڵرەق ئەبن بەرانبەر بەو کەسانە کە بوون بە جەلادی شەعبی کوردی!]. ئەمەی وت و پەتەکەی کردە ملی خۆیەوە.

«محەمەد حسەین خانی سەیفی قازی» لەو کاتەدا کە بردیانە بەر [قەنارە]کە، وتی:

[شانازی ئەکەم بەوەکە لە ڕێگەی نیشتمانا ڕۆیشتم، بژی حوکومەتی کوردستان]!. پاش ئەمە ئەویش پەتەکەی خستە ملی خۆیەوە.

[سەیفی قازی] پیاوێکی کەلەگەت و بەدیمەن بوو، کە سەرخرا بۆ سێدارەکە، پەتی سێدارەکە بچڕا، ئەبوایە ئیتر ئیعدامی نەکرایە، لەگەڵ ئەوەش هەر بەدەست خنکاندیان!.

پاش ئەمان «سەدری قازی»ش هێنرا و ئەویش بەدەستوری ئەوان ملی کرا بە پەتەوە. سەدر تا ئەو وەختە ملی کرا بە پەتەکەوە، هەر لەو بڕوایەدا نەبوو کە ئەیکوژن؛ چونکە گوناحی ئەو هەر نائیبێک بوو لە [تاران] و ڕاسپێرێک بوو لەم ئاخرەدا لەبەینی حوکومەتی تاران و حوکومەتی [سابلاخ]دا و هیچی تر.

لەپاش خنکاندنی ئەمانە؛ لە ڕۆژی ٧ی نیسانی ١٩٤٧دا چەند «قەنارە»یەکی تریان لەدەشتی ناوشاری سابلاخا دامەزراند و ئەمانەی خوارەوەشیان خنکاند:

١ـ رەئیس حەمید مازووجی. ٢ـ رەئیس رەسووڵ نەغەدەیی. ٣ـ ملازم عەبدوڵلا رەوشەنفیکر. ٤ـ ملازم محەمەد نازمی.

گوناحی ئەمانەش لەبەر چاوی ئێرانییەکانەوە ئەوە بوو کە لە قۆڵی سەردەشتدا پێویستی ویژدانی خۆیان بەرانبەر بە جمهوریەکی کوردستان بەجێهێناوە.

ئەمانە قوربانییەکانی «سابلاخ». لەناوشاری بۆکان ـ یش ئەمانەی خوارەوە ئیعدام کران:

(١) عەقید عەلی بەگی شێرزادی. (٢) عەقید محەمەد ئەمینی کەسنەزانی. (٣) ئەحمەدخانی فاروقی ـ خۆی و دوو برای ـ کە ئەمانە لە سەرۆکی عەشرەتی فەیزوڵلابەگی بوون (٤) ئەحمەد خانی کەلەتەگە (٥) مەحمودخانی تورکمانکەندی لە سەرۆکی عەشرەتی فەیزوڵلابەگی.

(٦) محەمەدخانی باباخان بەگ لەسەرۆکی عەشرەتی فەیزوڵلابەگی بەگی. (٧) محەمەدبەگی شێرزادی لە سەرۆکی عەشرەتی فەیزوڵلا بەگی. (٨) ئاغا سدیقی یازی بلاخی لە دانیشتووانی سەقز. (٩) عەلی ئاغای تەمووتە لە سەرۆکەکانی گەورک. (١٠) رەسوڵ ئاغای میرەدێ لەسەرۆکەکان عەشرەتی گەورک.

ئەوانەی کەوا بە فەرمانی عەسکەری ـ ئیعدام ـ کران تا ٥٠ کەسێک ئەبوون، ئەمانەش ئەوانە بوون کە داوای حەقی خوراوی خۆیانیان کردبوو، تۆڵەکەشیان ئەوەبوو کە پێیان درایەوە!.

لەدەوری حوکومەتی قازی ـ دا لە [سابلاخ] رۆژنامەی [کوردستان] دەرئەچوو، کە زمانی حاڵی حوکومەتەکە بوو، هەموو کارەسات و قەوماوی حوکومەتی تیا ئەنووسرا. هەروەها گۆڤاری [نیشتمان] و بلاوکراوەی تریش دەرئەچوو.

* * *

بەمجۆرە پەردە لەسەر حوکومەتی کوردستان و ئازەربایجان دادرایەوە!. مایەوە سەر ئەوە ئایا کارەساتی ئیمتیازی نەوتەکە لەولاوە بە چی گەیشت؟.

ئەوەبوو «قەوام» وتی پێویستە بە پارلەمانێکی تازە بۆ ئەوە بڕیار لەسەر ئیمزاکەی من بدا؛ بۆ دانی نەوتەکە. ئەو بەندانەی لەگەڵ روسیادا بەست و ئەم دەورانەی گێڕا، روس نەیروی خۆی کشاندەوە، ئەمیش بەناوی ئینتیخاباتی ئازادەوە وڵاتەکانی داگیر کردەوە، چونکە روس چاوەڕێی ئیمتیازی نەوت ئەکا، نابێ دوا بخرێ!.

لەپاش ئەوە کە ئەم، وڵاتەکانی داگیر کردەوە، لە راستیدا پارلەمانی تازە درووستکرا و باسی دانی ئیمتیازی نەوت بە روسیا ـکەوتە ئەو پارلەمانەوە. پارلەمان پێی دا بەزەویا وتی من بڕیار لەسەر دانی ئەم ئیمتیازە نادەم!.

دیارە ئەم کاسەیە بێ ژێر کاسە نەبوو!. واتە بێگومان ئەبێ لە ژێرەوە لەم رووەوە «قەوام» قسەی لەگەڵ ئەم پارلەمانەدا کردبێ!.

قەوام لە رواڵەتا دەستی کرد بەهاوارکردن لەگەڵ پارلەمانا وتی: «وەختی خۆی من ئیمزام داوە بە روسیا، ئێستە چۆن ئێوە بڕیاری لەسەر نادەن؟!.» پارلەمان وتی ئێمە دان بەو ئیمزایەدا نانێین!. قەوام لەسەر ئەمە گۆیا لە پارلەمان تۆرا و پاشان وەزارەتەکەی خۆی ـبەو ناوەوە کە پارلەمانی تازە باوەڕی نادەنێ ـلە حوکم کشاندەوە و لە ماڵی خۆی دانیشت!. روسیاش کەوتە قسەکردن وتی کوا ئیمتیازەکە؟ قەوام وەڵامی بۆ ناردەوە، وتی: «من بڵێم چی؟ خۆتان ئەزانن وەختی خۆی من ئیمزام دانێ و وتم ئەتاندەمێ، ئەوا ئێستە پارلەمان رازی نابێ، وەنەبێ سووچێکی منی تێدا هەبێ!.».

تازە روس ـیش نەیروی خۆی لە وڵات بردۆتە دەرەوە، هیچ بیانوویەکی تر بە دەستیەوە نییە بۆ هێنانەوەی نەیروا. بەقسەی کوردی ئەڵێ: «بۆ ریش چوو، سمێڵیشی نایە سەری!.» نە ئیمتیازەکەی دەستکەوت و نە حوکومەتەکانی کوردستان و ئازەربایجانیشی بۆ مایەوە!.

لە لاپەڕەی سیاسی [قەوامولسەڵتەنە]ی سەرۆک وەزارەتی ئێرانا ئەم کردەوەیە بەگەورەتر شانازییەکی ژیانی دائەنرێ و بەڵکو شایانی گەلێ ستایشە کە چۆن توانی ئەم پەردانە هەڵبگێڕێتەوە؟!.

* * *

سەرەنجامی ئەم شۆڕشانەی کورد لەم رۆژانەی دواییدا وایان بەسەر هات کە چاومان پێکەوت. ئەگەر ئاوڕێکی تر لە بارێکی ترا بدەینەوە، ئەم هەموو چەوساندنەوە و دەربەدەرییانە کە لەم ئاخرەدا بەسەر کورد دا هاتن، دوور نییە ئۆباڵی هەمووی بخرێنە ئەستۆی ئینگلیز و پاشان ئەمەریکا!.

ئینگلیز جەورێکی زۆری کرد لە کورد؛ لەپاش شەڕی ١٩١٤ ـ ١٩١٨ لەهەموو گۆشەیەکی کوردەوارییەوە، لەهەموو ئەو وڵاتانەوە کە کوردیان تێکەڵاو بوو، ئینگلیز بەهەموو جۆر دەستی تێخستن و بەهەموو چەشنە قسەیەک هاتە مەیدانەوە؛ کە باری تێک ئەچوو لەگەڵ حوکومەتەکانی کورد تێکەڵاو بوودا، بای ئەدایەوە لای کورد و قسەی بۆ هەڵئەڕشتن، کە باری چاک ئەبووەوە قەوانێکی تری ئەخستە سەر!. کە ئەکەوتە ناو کوردەکە خۆیشیەوە، بەسیاسەتە وشکە ستەمکارانەکەی هەرتاقە کوردێکی ئەخستە سەر ئەزمێک!.

لەبەر ئەمانە ئەتوانم بڵێم ئینگلیز زۆر زاڵم بوو، زۆر بێ بەزەیی بوو، زۆر بێ سیاسەت بوو، پەنجا ساڵ لەمەو پێشتر بە چ جۆرە سیاسەتێک لەگەڵ ئەو عالەمەدا ئەبزووتەوە، ئێستەش بەعەینی سیاسەت ئەهاتە ناوەوە، دنیا گۆڕا، سیاسەتی ئەو نەگۆڕا!. لە درۆ بەولاوە هیچ کردەوەیەکی تری نەنواند لەگەڵ کورددا!.

«باشچاوش»ە بە پایەگەیشتووەکانی لە عێراقا بە هۆی ئەوەوە ئەیانوت لە «ئینلگیز» چاکتر نییە بۆ کورد؛ چونکە سەربەستی داوەتێ و ئەتوانێ بە ئاشکرا بڵێ من کوردم!.

راستە! هەر کەس بە پێی [نەفسیەتی] خۆی قسە ئەکا. ئینگلیز بۆ ئەوان باش بوو چونکە پایە دروزنەیەکی پێدا بوون، بەلام بۆ کورد ئەگەر باشی ئەوە بێ کە لە ماوەی پەنجا ساڵا کورد هەر ئەوەندەی پێ ببڕێ بڵێ «من کوردم»، دە خوا ئەو باشیە ببڕێ!. لەوماوەی ئەو پەنجا ساڵەدا پەنجا قەوم لە چاڵی نزمیەوە گەیشتنە چڵەپۆپەی بەرزی و سەربەستی، کە چی سەربەستی کورد ئەوەبوو کە بتوانێ بڵێ من کوردم!. دیسان ئەڵێم خوا ئەو چاکیە ببڕێ!.

بەڵێ ئەمە راستە کە دنیای ئێمرۆ و دنیای پێشینیش لەسەر قازانجی شەخسی بڕاوەتەوە و ئەبڕێتەوە، دوور نییە قازانجی ئینگلیز بە پێی ئەو رۆژانەی رابوردوو لەوەدا نەبووبێ کە کورد ببێ بە شتێک؛ لەم رووەوە بالۆمە نەکرێ، بەلام لۆمە کردن و جەورەکەی لەوەدا بوو، کە کوردی ئەکرد بە قۆچی قوربانی بۆ قازانجی خۆی!. وەکو بڵێیت لە «ئینجیل» دا بۆی نووسرابوو کە ئەبێ لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست و خوارووودا بۆ پێشکەوتنی ئیشی ئەو؛ ئەبێ قەومی کورد بکا بە

گاوگەردوون!.

ئەگەر ئەمە لە «ئینجیل» دا نووسرابێ، بێگومان ئەوەش هەر نووسراوە کە ئەبوایە ئینگلیز بۆ ئەوە تووشی ئەم رۆژەی ئێستە نەبێ، سیاسەتی پەنجا ساڵەی تێک بدایە و بیزانیایە کە رۆژان رۆژی لە دوایە و رەورەوەی دنیا لەگەڕانایە و رووە و پێشەوە ئەڕوا!.

ئەمە ئینگلیز، ئەمجا ئەمەریکا:

ئەمەریکا تا شەڕی دووهەمی گەورە بە گۆشەگیری لە ولاتی خۆیا بۆ خۆی دانیشتبوو خەریکی بازرگانی بوو. کە شەڕی دووهەم هاتە پێشەوە؛ لە کولانەی خۆی دەرپەڕی و کەوتە کۆڕی سیاسەتی عالەمییەوە، «سینی»یەکی خستە سەر دەستی، هەندێ نوقڵ و نەباتی تێخست و گێڕای بە عالەما، هەر کەس لەو نوقڵ و نەباتە بخوا؛ ئەبێ کەوایەکی ئاوەڵدامانی «ئیستیعماری» بۆ لەبەر بکا!.

وردە وردە بەم سینیەوە بینی پێوەنا، تا گەیشتە [ئێران] و [تورکیا]، تا گەیشتە عێراق و پاشان ولاتە عەرەبەکان، لە ئاخر چۆڕا گەیشتە ولاتی کوردستان و لە خاکەکەیا بە هەموو جۆر و لە هەموو لایەکەوە کەوتە بنج داکوتان. نوقڵ و نەباتی بلاوئەکردەوە بەم ولاتانەدا، وەکو کورد ئەڵێ ئەبێ «خێری دایکی شای کردبێ!.». ئەمە پەندێکی کوردییە بۆ ئەم جۆرە شتانە ئەوترێ!.

بەلام ئەگەر لە راستیا ورد ببینەوە، ئەمە خێر نەبوو، بەڵکو خوێنمژین و هێزمژین بوو، لە ناوبردنی پیاوانی پیاو و ئازا بوو، بناغەی داکوتانی [ئیستیعماری] بوو بۆ خۆی، بۆ ئەو تا زەمانێکی دێرینە لەم ولاتانەدا بمێنێتەوە.

کارەساتەکەی «مسەدق» و «زاهدی» لە تاران، گەواهی ئەوەمان بۆ ئەدا کە «ئەمەریکا» بۆ لە ناوبردنی پیاوان و پێشکەوتنی ئیشی خۆی، چ جۆرە پەنجەیەکی ئیش ئەکا و چ جۆرە پیاوانێک بۆ خۆی درووست ئەکا؟!.

یا فرۆکەکانی کە ولاتی [قازی محەمەد] و کوردستانی ئازادی قازی محەمەد ـی پێ بۆردمان ئەکرد، ئەم شاهدییەمان بۆ ئەدەن کە تا چ ئەندازەیەک [ئەمەریکا] دڵی بە ولاتی کوردەواری ئەسووتێ!. وا دیارە عەدالەت پەروەرەی و دیموکرات پەروەری [ئەمەریکا] لە ولاتی کوردەواری وێنەی «واشنتن» ئەگێڕێتەوە!.

ولاتی کورد هەر هی کوردە، ولاتی کوردی ئێستە غەیری ولاتی کوردی پەنجا ساڵ لەمە و پێشترە؛ ولاتێکی دەوڵەمەندە، سەرمایەی حوکومەتی پێشە سازەکانی تیایە، بووە بە شوێنی تەماشای هەموو کەسێک، ئەگەر [ئەمەریکا] بە جۆرێکی پیاوانە و مەردانە لەوەختی خۆیا لەگەڵی بهاتایەتە مەیدانەوە، تووشی ئەم رۆژە نەئەبوو، کە هەر ئەبێ بیکوتێ و نەیگاتێ!... هەموو ئیستیعمارێک ئەبێ دوایی بێت، هەموو قەومێکیش ئەبێ ئازادی ببینێت. ئەوانەی کەوا سیاسەتیان غەیری ئەم دوو قسەیەیە، بێگومان ئەبێ چاوەڕوانی پووکاندنەوەی خۆیان بکەن!.

بەڵێ!. بێجگە لە [ئینگلیز] و [ئەمەریکا] میللەتەکانی تریش، ئەوانیش ئەو گاڵتەیە کە ئەوان بە کوردیان کردووە و ئەیکەن، ئەمانیش کردوویانە و ئەیکەن! بەڵام لام وایە کوردەکە وەکو وڵاتەکەی غەیری وڵاتی پەنجا ساڵ لەمەو پێشترە؛ خۆیشی غەیری قەومەکەی پەنجا ساڵ لەمەو پێشترە، ئەگەر ئەو هەستەی تا ئێستە بۆ پەیدا نەبووبێ، کە خەڵکی لەوەختێکا ئیشیان پێیەتی بە گاڵتەوە قۆڵ ئەکەن بە قۆڵیانا و پاش ئەوەکە ئیشەکەی خۆیانیان بنج بەست کرد، ئەمجا دەستیان لەدەست ئەکەنەوە و ئەکەونە چەوساندنەوەیان!. ئەگەر ئەم هەستەیان تا ئێستە بۆ پەیدا نەبووبێ. بێگومان چ ئێستە و چ لەمەو دوایش ئەو هەستەیان ئیتر بۆ پەیدابووە و ئەبێ و بڕوا ناکەم ئیتر هەڵبخەڵەتێن.

لەبەرئەمە ئەوانەی کە تەماع ئەکەنە کورد، لام وایە وەنەبێ ئیشێکی باش بکەن، لەگەڵ کورددا بەبرایەتی بژین گەلێ باشترە بۆیان کە بێنن هەڵیانبخەڵەتێنن، باشترە بۆیان چونکە ڕەوڕەوەی زەمان بە جۆرێکی تر سنگ ئەنێ بۆ پێشەوە، تەبیعەت لە ئاسۆی ڕزگاریدایە نەوەک لە هی دیلی و چەوساندنەوەدا!. دیارە کوردیش ئەمانەی هەموو لەبەرچاوە و بەدەنگی دەهۆڵ تا ئەندازەیەک شوێن ئەکەوێ!.

**[بۆ دانانی ئەم کتێبە سەیری ئەم سەرچاوانەی خوارەوەش کراوە:]**


۱ـ شرفنامه — شرفخانی بتلیسی
۲ـ تاریخ مردوخ — آیت‌الله کردستانی
۳ـ تاریخ اردلان — ناصر آزادپور
۴ـ اسرار بارزان — دکتر اسماعیل اردلان
۵ـ خلاصه کرد و کردستان — محمدامین زکی
۶ـ مشاهیرالکرد — محمدامین زکی
۷ـ امارة بهدینان — صدیق الدملوجی
۸ـ تاریخ الوزارت العراقیة — سیدعبدالرزاق الحسنی
۹ـ الضحایا الثلاثات — عبدالمنعم الغلامی
۱۰ـ القضیة الکردیة — دکتور بلەچ . شێرکۆ
۱۱ـ بارزان المظلومة — معروف جیاووگ
۱۲ـ یادداشت — مامۆستا ڕەفیق حیلمی
۱۳ـ مێژووی ئەدەبی کورد — عەلائەدین سەجادی
۱۴ـ هەڵکەوتێکی دیری — حوسێن حوزنی موکریانی
۱۵ـ مەسەلەی کوردەکان — و.جی.ایلفنستن. وەرگێڕی [عەبدولقادر حیشەمت]
۱۶ـ از مهاباد خونین — نجفقلی پسیان
۱۷ـ مرگ بود و بازگشت هم بود — نجفقلی پسیان
۱۸ـ یادداشتی دەستنووس لە بارەی سابلاّخەوە — عەبدولڕەحمان زەبیحی
۱۹ـ گۆڤاری گەلاوێژ
۲۰ـ الخرائط و المساحات العراقیة
۲۱ـ ئەو شۆڕشانەی کە لە بارەی عێراقەوە دەرچوون
۲۲ـ ڕۆژنامە کوردی ـ یەکان

## «ناواخن»



**سەرنج:**

بەشی دوایی ئەم کتێبە؛ بەناوی [کورد و کۆماری عێراق] بە گوێرەی نامەی ژمارە ١٥/١٠١٨٧ی ١٣٧٤/١١/١٥ی وەزارەتی فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی، چاپ نەکراوەتەوە.